# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە
لەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

ژمارە 12 ایلول 1983



لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ت : 20082

لە یەکەم بیرەوەری لەدایك بوونی «کاروان» دا :

# با کـــاروانـــی ووشـــەی کـــوردی هـــەر لـــە پـتـەوبـووـنـدا بـێ

بە دەرچوونی ژمارە 12ی گۆڤاری «کاروان» ساڵێکی ـمبەق لە تەمەنیدا تێدەپەڕێ ئەو تەمەنەی کە پڕیەتی لە ـەرهەمی نایابو ڕێو شوێنی دێرینی ڕۆشنبیری . ئەوەبو لە مانگی تشرینی یەکەم ساڵی 1982داو بە دەستپێشخەری بەڕێز ـەمینداری گشتی ڕۆشنبیریو لاوانو بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانو نووسینگەی بەڕێز جێگری سەرۆکی وەزیران ، ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان بە هاوکاری کۆمەڵێك لە نووسەرو ڕۆشنبیرانی کورد «دەستەی نووسەران» ژمارەی یەکەمی گۆڤاری «کاروان»ی دەرکرد .

گۆڤاری «کاروان» بەهەموو شانازییکەوە کە یەکەم مۆمی ژیانی خۆی دەکوژێنیتەوەو لەو ماوە کەمەی تەمەنی توانیویەتی لەسەر پێ بوەستێ لە مەیدانی ڕۆشنبیری داو چاکترین پێنوسە کوردیەکانو هەزاران ڕۆشنبیرو خوێندەواران لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە لە هەموو شارو شارۆچکە کوردیەکانو شوێنی تریش لە دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمیداو بە ماوەیێکی کەم پاش دەرچوونی بووەتە یەکێك لە بەناوبانگترین گۆڤارە کوردیەکانی ئەمڕۆمانداو باشترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە زۆریی ئەو بابەتو نامانەن کە بۆی دێن لەگەڵ فرۆشتنی ژمارەییکی زۆری لە کتێبخانەکاندا .

کاروان بۆیە هاتۆتە کایەوە تا پێویستیە ڕۆشنبیریەکان دابین بکات . لەتەك زۆر بوونی ڕۆشنبیرانو خوێندەوارانی کورد دوای جێبەجێ کردنی خوێندن بە زمانی کوردی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندنداو پاش بەرەوپێشچوونی ڕۆشنبیری کوردیو کۆمەڵگای کوردەواری لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی 17—30ی تەممووزی پیرۆزداو سەرکەوتنی تاقیکردنەوەی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانداو لەگەڵ بایەخی بەردەوامی سەرکۆمار «صدام حسین» بە ڕۆشنبیریو ڕۆشنبیرانی کوردو تێکڕای گەلی کورد بە تایبەتی پاش ئەوەی کە بو بە سەرکردەی پارتو دەوڵەت . بەم شێوە «کاروان» یەکێکە لەو دەرگا ڕۆشنبیریە گرنگانەی گەلی کوردمان ، سەرچاوەکەی لە پێشکەوتنی کۆمەڵگای کوردەواریو بەرەوپێشچوونی ڕۆشنبیری کوردیەوە هەڵقووڵاوە .

جا پاش ئەوەی کە گۆڤارو بڵاوکراوە کوردیەکان دەوری کاریگەری خۆیان دیوەو دەیبینن لە بڵاوکردنەوەو دەوڵەمەند کردنی ڕۆشبیری کوردی بە تایبەتی گۆڤارەکانی «بەیان» و «ڕۆشنبیری نوێ» و «هاوکاری» و «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق/ دەستەی کورد . هتد . . «کاروان» پەیدا بووەو ئەوە دەرچووە تا هەمان دەوری ئەو گۆڤارو بڵاوکراوە کوردیانە دەوڵەمەند بکات ، سوود وەرگرتنیش لە پسپۆڕیو ڕێڕەوی ئەوان هۆیەکی گرنگی سەرکەوتنو بڵاو بوونەوەیەتی ، بۆیە «کاروان» شان بە شانی ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانە هەدوڵ ئەدا بۆ بڵاوکردنەوەو پێشخستنی وێژەو هونەری کوردیمان . «کاروان» هەر لە یەکەم ژمارەیدا بایەخی تەواوی بە هەموو لایەنەکانی وێژە لە : شیعرو چیرۆكو لێکۆڵینەوەو شانۆگەریو ڕەخنەو مێژوو وەرگێڕانو .. هتد داوە . تا لە کۆتاییدا بووەتە گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی کە زۆربەی نووسەرو ڕۆشنبیرو خوێندەواران لە دەوری کۆبونەوە . وە لەگەڵ کەمی تەمەنی کە بە مانای کەمی تاقیکردنە وەو توانا و هۆی تری لاوازی ، کە چی لەگەڵ ئەمەشدا توانیویەتی سەرکەوتووانە زۆر چالاکیو جموجۆلی وێژەییو ڕۆشنبیریی گرنگ ئەنجام بدا وەك :

بلاوکردنەوەو خستنە ڕووی هەموو کارەکانی دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی کە لە شاری هەولێرو لە هاوینی ساڵی 1982دا بەسترا لەتەك دەرهێنانی پاشکۆیێکی رێك بە بۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزو هەفتەی «قادسیەی صدام» جگە لە تەرخان کردنی ژمارەییێکی تەواوو تایبەتی بۆ شانۆ لەگەڵ خستنە ڕووی ئاهەنگەکانی شۆڕشی 17— 30 تەمموزی ساڵی 1983 داو بایەخدان بە یادی سێیەمی بەرپا بوونی جەنگی پیرۆزمان دژ بە رژێمی ئێرانیی گۆمان لێکراوو دەست درێژ کەر بۆ سەر گەل و وولاتمان ئەمەو جگە لە خستنەرووی گەلێ بۆنەی نیشتمانیو میلیی گرنگ لە ژیانی گەلی عیراقداو هەر وەها بلاوکردنەوەی دەنگو باسی چالاکییە رۆشنبیریەکان لەناوچەی کوردستاندا .

سەرکەوتنی گۆڤاری «کاروان» و جێگیربوونی لە ناو دڵی هەزاران خوێنەر دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك :

1 - بوونی فراوانترین «دەستەی نووسەران» لە نووسەرو رۆشنبیرو رۆژنامەنووسی وا کە تواناو بەهرەی وێژەییو رۆشنبیری چاکیان هەیەو جێگای خۆیان لە مەیدانی وێژەو رۆشنبیریدا کردوتەوە بە شێوەییێکی باش .

2 - ئەنجامدانی کاروبار لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە بێپاداش وەیان بلێین بێ مووچەی دیارکراو ئەم شێوەیەش بەرهەمێ ئەنجام دەدات چونکە لە ئامانجێکی پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەسەر بنچینەی لە خۆبردنو گیانی زانستانە چەسپاوە .

3 - دەرچوونی لە مەلبەندی ئۆتۆنۆمی لە هەولێردا ئەمەش وای لێ دەکات کە راستەوخۆ لەگەڵ خوێنەرو رۆشنبیرو نووسەراندا هەڵسو کەوت بکات .

4 - دەرچوونی بە شێوەییێکی رێكو بەردەوام ، چونکە ئەو گۆڤارە کوردیانە کەمن کە توانیویانە بەردەوامبن لەسەر دەرچوونی رێكو پێکیانەوە . بۆیە بەردەوام بوونو دەرچوونی بە شێوەیێکی رێكو پێك وای لێ کردووە کە ببێتە جێی بڕوای رۆشنبیرو خوێنەران .

5 - پشتگیری کردنی بێسنوور لەلایەن دەسەلاتداریەتی نیشتمانی .

6 - دەرچوونی بە زمانی کوردیو عەرەبی کە ئەمەش وای لێکردووە کە خوێنەرانی هەردوو زمان لە دەوری کۆببنەوەو ، جۆرەها بەرهەمو نووسینی بۆ دەنێرن .

ئەوەی شایانی باسە ئەو نووسینانەی کە بە زمانی عەرەبی تێیدا بلاو دەکرێتەوە بۆ خزمەتی رۆشنبیریی کوردی تە رخان کراوەو بەشی عەرەبی لە «کاروان»دا وێژەو کەلەپووری گەلی کورد بە خوێندەواری عەرەب دەناسێنێ .

7 - کۆبوونەوەی نووسەرانو رۆشنبیرانو خوێنەواران لە دەوریدا .

بە ڕای ئێمە ئەو خالانەی سەرەوە بناغەی سەرەکین کە «کاروان» خۆی لە سەریان راگرتووە بۆ گەیشتنی لووتکەکانی سەرکەوتن لە ماوەی سالێکی تەمەنی . بەلام لە گەڵ هەموو ئەمەشدا ئەو بۆشاییەی کە «کاروان» پڕی کردوتەوە لە رادەی خواستەکانماندا نییە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر چەند هۆیەك ، وەك کەمی کادیری رۆژنامەنووسو هونەری لە ناوچەکەداو نەبوونی چاپخانەی خۆی تا ئێستا لە هەولێر ، چونکە چاپکردنی ئەم گۆڤارە لە بەغداوە ئەنجام دەدرێ ئەمەش کاتو پارەی زۆر بە فیڕۆ دەبات . هۆی هەرە گرنگیش کە وامان لێ دەکات هەست بکەین گۆڤارەکە وەکو پێویستە وا نییە ، بەوەدایە کە لە باری ئەو جەنگە دوژمنکاریە دەرچووە کە تاقمی خومەینیی نەزان هەڵیگیرساندووە دژ بە گەلو وولاتمانو تێپەڕ بوونی وولات بە بارێکی نائاسایی بە هۆی جەنگەکەوە .

لە کۆتاییدا ، گۆڤاری «کاروان»و نووسەرو خوێنەرانی کە ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی یەکەم بیرەوەری لەدایك بوونی ، بەڵێن بە جەماوەری رۆشنبیرو هەموو خوێندەواران دەدات کە هەمیشە جێگای بڕواو رەزامەندیان بێتو بیرو رای بەرزو مرۆڤانە ئەو بیرو ڕایا نەی خۆشەویستیو دۆستایەتیو گیانی برایەتی لەنێوان هەردوو گەلی برا ، گەلی کوردو عەرەب بچەسپێنێو بەشداریێکی کاریگەر لە جەنگی گەلەکەمان جەنگی «قادسیەی صدام»ی پیرۆز بکاتو لەم بڕوایەش دایە کە هەمیشە سەرکەوتوبۆ گەلو سوپاو سەرۆکی نەبەزمان بێ لە جەنگی پیرۆزمان دژ بە تاقمی خومەینیو هەموو هێزە ڕەشەکانی جیهاندا .

بژی کاروانی «کاروان» گۆڤاری ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیریو لاوان ، گۆڤاری رۆشنبیرانی کورد .

**«دەستەی نووسەران»**




# لە زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی دا

● محەمەد ئەمین هەورامانی ●

**روونکردنەوەیێ** : ویستم نەختێ دەربارەی (کە) وەك (ڕاناو) لە لایەکەوەو وەك (ئامراز) لە لایەکی دیکەوە بزانم گوایە بەو نیازەی کە ئەم زانینە لە چوارچێوەی سەرپێی دەربچێ بۆیە هەوڵو تەقالامدا ، هەندە سەرچاوەیێ کە دەربارەی ڕستەی زمانی کوردی هەر زۆر نەبێ کەمیان وتبێ بخوێنمەوەو ئەو بیروڕای خۆمە کە هەمە دەربارەی (کە) وە بەهۆیانەوە فراوانی بکەمو گەشەیپێبدەمو بتوانم شتێکی نوێ دەربارەیەوە بنووسم .

ئەم هوروژمی لافاوی ویستنی دەروونە یانەی بیرمی جەنجاڵکردو بە جۆرێ وایلێکردم کە بە دوای سەرچاوەدا بگەڕێم بە تایبەتی ئەو سەرچاوانەی کە دەربارەی ڕستەی ئاوێتەو لێکدراوەوە نووسیویانە .

شایەنی باسە ئەوەی کە دەربارەی ئامرازی (کە) وە نووسرابێ زۆر کەمە بەڕادەیەك مرۆ توانای کوڵ دەبێ ئەوجا لە ژێر جەنجاڵی کۆمەڵی پرژو بڵاوی ڕستەدا چەند (کە) یی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ هەڵبگەوزێ بێگومان ئەم چەند (کە) ش لە شێوەی کەرەستەی خاودان ...

لە نێو دوو توێی زۆربەی سەرچاوەی کوردیدا وەك کەرەستەی ڕستە دروستکردن ، (کە) خراوەتە نێو ڕستەوە ، بەلام زۆربەی زۆریان تەنیا بە مەبەستی هێنانەوەی ڕستە نەك بە مەبەستی دیاریکردنو ڕۆشنکردنەوەی (کە) و ئەرکی . ئەوەی کە من سوودم لێ وەرگرتبێ وەك سەرچاوە بەلای منەوە شایەنی یادکردنەوە بن ئەمانەن : ـ

کتێبەکەی دوکتۆر مەکارۆز ( AKurdish Crammar ) ە . لێرەدا دوکتۆر مەکارۆز باسێ (کە) ی کردووەو وتوویەتی کە (کە) واتای ( which ) و ( who ) ی ئینگلیزی دەداتو لە ڕستەیەكدا

بەکاری هێناوەو ئەو ڕستەیەش ئەمەیە : ( ئەو نانەی کە سەگەکە خواردوویەتی کۆن بوو ) ل ـ 101 .

دوکتۆر مەکەنزی لە کتێبەکەیدا کە بە ناونیشانی -Kur) dish Dialect Studies — 1) ە وەیە باسی (کە)ی لە زاری کوردیی ناوچەی سلێمانیدا کردووەو وای لە قەڵەم داوە کە واتای

(Who)ی ئینگلیـزی دەداو بەم جـۆرەش لە فرەیـزدا بەکـاری هێناوە :

سەلاحەددین کە دنیای گرت ....

هـەروەها مـامـۆستـای نـاوبـراو بـە واتـای (Which)ی ئینگلیزیش بەکاری هێناوەو بەم جۆرە :

ئەم ئاسکانەی کە ئەلەوەڕێن ، (ل ـ 131) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە کتێبی (ڕێزمانی کوردی) دا بـاسی (کە)ی وەك ئامرازی گەیەنـەر کردووەو لە سێ جـۆرە فرەیـزو لە ڕستەدا بەکاری هێناوە .

لەلایەن نووسەری ئەم ووشەیەشەوە وەختێ خۆی باسی چەند ئامرازێکی (پەیوەست) بە سادەو لێکـدراویەوە کـراوەو

یـەکێ لەوانـەش (کـە) ی بـووەو لە ڕستـەی ئـاوێتـەشدا بەکارهێنراوە .

ئەوەی شایـەنی باس بێ کتێبـەکەی دوکتـۆر ئیبراهیم عەزیز ـ ە کە بە شێوەیەکی دوورو درێژ باسی (کە) ی کردووەو وەرگرتەی زۆری ـ لە پەخشان‌و لە شیعر بە وێنەی جۆراوجۆر بۆ هێناوەتەوە . ناوی سەرچاوەکانی بە زمانی بێگانەو بە زمانی

کوردیش تۆماری کردوون .. بەرهەمەکەی بە چەند بەشێکەوە بەش‌کردووەو هەر لقێ لەو لقانـەش کە لەو بـەشانـە جییای کردوونەتەوە ناوێکی درێژی لێناوە . ئەگەرچی کارەکە نامەی

دوکتۆرایە بەلام تێبینینێکی زۆرم دەربارەی سەرپاکی هەیە لەگـەڵ ئەوەشـدا لە کتێبخانـەی کوردیی‌دا هـەر کـەلێنێکی پرکردۆتـەوە . لە سەرانســەری کتێبەکـەی‌دا دوکتۆر وای لە قەلەم داوە کە (کە) هەر تەنیا ئامرازی گەیەنەرە ...

لە ڕێزمان‌و ئاخاوتنی کـوردی ) کتێبی لیژنـەی زمان‌و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردی‌دا باسی (کە) وەك ئامرازی ( پەیوەست = عطف ) کراوەو بە چەند جۆرێکیش لە رستەدا بەکار هێنراوە .

ئەوەی کە من لێرەدا دەمەوێ بڵێم‌و بیخەمە بەرەست تـوێژاڵێکی کـەمەو نـەختێ لە پوختیش دەکـاو بێگومـان بـۆ

پاشەڕۆژیش زیاتر گەشە دەسێنێ ، ئەگەر هاتوو زمانناسانی خۆشەویست بە چاوی رەخنـەی دلسۆزانـەوە گوڵاوی بیـری خۆیان بە سەری‌دا پرژاند .

ئەم وتارەی من کە بۆ تەنیا (کە) و دەست‌و پێوەندەکەی ئامادەم‌کردووە ، سوودم لە زۆر سەرچاوەی ئەدەبی شاعیرە کـلاسیکیـە نـاودارەکـانی کـورد وەرگـرتـووە . بـۆ دەست نیشان‌کردنی بەڵگەکان بە پێی توانا گەڕاوم‌و وێنەی شیعریم

بۆ هێناونەوەو تەقەلاشم داوە کە ئەو وێنەیە زیاتربێ لە یەك بۆ ئەوەی بەتەواوی ڕاستی بەکار هێنانەکە بێتە دەستمەوەو دڵم ئاو بخواتەوە .

ئەمویست وێنەی شیعری ئەو شاعیرانە بهێنمەوە کە بە هەورامانی ( زاری گۆران ) ئاوازەیان هۆنیوەتەوە ئەویش هەر لەبەر ئەوەبوو نەوەکو وتارەکە دوورو درێژبێ .

**(کە)** : بە شێوەیەکی فراوان (کە) لە لایەن نووسەرانەوە بـە سەلیقەی زمان بەکار هاتووە ، لای هەندێ کەسیش بە جۆرێ بەکار هێنـراوە کە لەبـوونی شیرازەی پێـویستی‌دا چووەتـە دەرەوە .

بەکارهێنانی بە شێوەیەکی گشتی لایەن زمانناسانەوە بۆ مـەبەستی دیـاری کردنی‌و نـاونیشان هـەڵدانی‌و ئەرکی لە ڕستەی جۆراو جۆردا لە دوو بارەکردنەوەی چوارچێوەیـەکی تەسك بەدەر نەبووە ، زۆربەی زۆری زمـانناسـە کوردەکـان (کە) یان بە ئامرازی (پەیوەست) بە واتای (عطف) ی عارەبی لە قەلەم داوە . زمانناسە بێگانەکان مەبەستم دوکتۆر مەکارۆزو دوکتـۆر مەکـەنزی ـ یـە بە ڕانـاو ( reLative ) ناویـان بردووەو بەرامبەریشی ووشەکانی ( who ) و ( which ) یان داناوە .

بۆ ئەوەی ئێمە لەوە بینەوە کە ئایا ئەم (کە) یە ئامرازی ( پەیوەست = عطف ) یا ( ڕاناو = relative ) یا خود جارێ

ئەمیانەو جارێ ئەویان و جارێکی دیکەش هی‌ترە ، بەلای منەوە پێویستە پەنا ببەینە بەر لێکۆڵینەوەی بەراوردی نێوان ( ئامرازی ـ پەیوەست ) و کردەوەی ( ڕاناوی ) (کە) و کردەوەی ( جۆرەکانی دیکەی ) دا ئەگەر هەیبێ !!.

شایەنی باسە ئامرازی پەیوەست لە زمانی کوردی‌دا زۆرن و جۆراو جۆرن ، بەلام هەموویان یاخود زۆربەیان لەوەدا بەشداری دەکەن کە هەریەکە لەوانە توانای ئەوەی هەیە دوو ڕستەی ساکار بە یەکەوە (بەند) بکاو بەستنەکەش زۆربەی وەخت بە جۆرێکە بەبێ هەوڵ و تەقەلای زمانناسانە ، هەر بەلابردنی ئامرازەکە ڕستەکان لەیەك جوێ دەبنەوەو هەر ڕستەیەکیش لەو ڕستە ساکارانە بە تەواوی وەك جارانی پێشوویان واتای سەربەخۆ دەبەخشێ .

والێرەدا هەندێ وێنەی جۆراوجۆر بۆ مەبەستی هێنانەوە یاد بەرچاو دەخەین : لەم وەرگرتەیەی گۆران‌دا ، (و) ئامرازی پەیوەستەو دوو ڕستەی ساکاری یەك لە دوای یەك بە یەکەوە بەند کردووە . گۆران دەڵێ :

**« ئەی گوێ ، زەلیلی چاوم (و) بەر تۆ پەنا ئەبەم »**

بۆ هەمان وێنە قانع‌یش هەمان ئامرازی بەکار هێناوەو دەڵێ :

**« تۆ نە مردووی ئەی سەلاحەددینی ئەیوبی لە قەلب هەر بژی ئەی فەخری کوردو حاکمی ملکی عەرەب »**

( دیوانی قانع ، ل ـ 58 )

(بەلام) وەك ئامرازی پەیوەست کاردۆخی بەم وێنەیە بەکاری هێناوە :

**« من وا ڕۆیشتم (بەلام) نەبینن بێگانە پەرست چۆن حەق ئەسێنن »**

( دیوانی کاردۆخی ، ل ـ 54 )

ئەمانەش وێنەی جیاواز جیاوازی (کە) ن کە هەر یەکەیان بە جۆرێ و بە ڕواڵەتێ بەکارهێنراوە هەیانە بۆ ئاوێتەکردنی ڕستەی ساکار وەك هەردی لەم دوو وێنەیەدا وتوویەتی :

**« ئیتر ئەی کێ هەیە ئەمڕۆ (کە) دەربەستی ژیانت بێ لە گەرمەی ئینتیخاباتا سبەینێ پشتیوانت بێ »**

یاخود دەڵێ :

**« دەسا پڕ بەدەم بقیژێنن : کە ئیستیعماری ئینگلیسی برووخێ تەفرو توونابێ سەرو فەسسالی نەگریسی »**

( هەردی ـ کاروانی شیعر ، ل ـ 143 )

ئەمانەی خوارەوە هەندێ نموونەی ترن وەك :

( پیاوێکی کە هات ) بە واتا : ( پیاوێکی‌تر هات ) . لە شێوەی سەرسوڕمان و پرس‌دا ، وەك :

« ڕۆژێك شتێکم ئەخوێنەوە ، کە لێبوومەوە . سەر لەنوێ لە دڵی خۆما وردم ئەکردەوە لەمەوە کوتوپڕ ئەوە هات بە بیرما : کە ئایا من چیم ؟

( مێژووی ئەدەبی کوردی ، ل ـ 9 ) لە شێوەی دیاری کردندا : « مامۆستا گیان ، ئاخ خۆزگە پارەم ئەبوو هەموو نوسخەکانی (کتێبەکە) تەنیا خۆم ئەمکڕی تاوەکو مەجبوورتان بکەم جارێکی‌تر لە چاپی بدەنەوە »

( مێژووی ئەدەبی کوردی ، ل ـ 8 ، رفیق حلمی )

دیارە بەهۆی ئەو وێنانەی سەرەوە کە بە نموونەی بەراوردکردن هێنانمانەوە بۆمان هەیە بڵێین ئەو ڕستانەی کە (کە) دەوری هەیە لە دروستکردنیان‌دا چەند جۆرێکن یاخود (کە) خۆی لە ئەرك‌دا چەند جۆرێکە :

1 ـ هەیە ، دوو ڕستەی ساکاری پێکەوە گرێ داون و یەکێ لەو ڕستانە زۆر دیاری و سەر لەبەرەو وەك شاڕستەبێ وایەو من ناوم لێ ناوە ( سەرە ڕستە ) و پاش جیاکردنەوەی لەوی دیکە واتای سەربەخۆی تەواوی هەیە . ئەوی دیکەیان کە بە (کە) یەکەوە بەستراوەو گرێ دراوە وەك ( سەرە ڕستە ) کە ، گرنگ نییەو ، ئەگەر هاتوش لەڕستە ئاوێتەکە جیاکرایەوە واتای تەواو نابەخشێ و ئەم ڕستەیەی ئێرە کە ناوی ( وەچە ڕستە ) مان لێ ناوە پەیوەندییەکی بە تینی ئاوەڵتاویانەی لەگەڵ ووشەی (سەرە) دا هەیە . بۆ وێنە بێکەس دەڵێ : ـ

**« دڵ کە کانگای مەعریفەت نەبێ**
**سەرچاوەی عەشق و مەحەببەت نەبێ »**

( دیوانی بێکەس ، ل ـ 84 )

هەروەها قانع دەڵێ :

**« من کە (کوردم) ، بابنووسم دەفتەرو دیوانی کورد تا**
**بەلەد بن ئەو کەسانە ، موددەعین میزانی کورد »**

( دیوانی قانع ، ل ـ 76 )

2 ـ هەر لەم جۆرەی سەرەوەو بە رواڵەتەکانیەوە هەر تەنیا تاقە رواڵەتێك نەبێ کە ئەویش بۆرە خزمایەتییە کە بەر وێنەی ترمان هەیە بۆیە بۆمان هەیە ناوی ( ئامراز )ی لێبنێن چونکە بۆرە خزمایەتیەکە هەروەك وتمان نەماوە ، ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی کەشەوە وەك ( کاری ئامراز ) کاری وەرگرتووە بۆ وێنە گۆران دەڵێ :

**« هووەیدایە لە ڕەنگی ئاڵی دەستت**
**کە دائیم پیشەتە قەتڵ و جینایەت »**

( دیوانی گۆران ، ل ـ 68 )

**لە جێگایەکی دیکەوە گۆران دەڵێ :**

**« (کە) هاتە گوێمەوە دەنگت بە نەغمەیی نەرمت وتت : چ مفتە تەماشا بە نرخی بێ عاری »**

( گۆران ، ل ـ 73 )

3 ـ هەشە وەك ئامرازی پەیوەست ـ پەیوەستی ئاسایی ـ دوو ڕستەی ساکار بە یەکەوە بەند دەکا ، ئەم نموونەیەش کەمە . بۆ وێنە گۆران دەڵێ :

**« بەم جوانی‌یانە : (کە) زینەتی بەهەشتی دنیان بەمجوانی‌یانە : (کە) لە تۆدا هەموویان پەیدان »**

( گۆران ، ل ـ 44 )

4 ـ هەیە ، وەك پاشبەند هەر تەنیا بۆ ناسینەوەیەو بەند دەبێ بە ناوەوە بە شێوەیەکی ڕوونتر ، لێرەدا (کە) بۆ مەبەستی دیاریکردن و ناسینەوە بە کۆتایی هەندێ (ناو) یاخود (ئاوەڵناو) ەوە دەلکێن و شایەنی باسیشە ئاڵوگۆڕی (کۆ) کردنەوە بەسەر ئەمدا دێ کە پاشبەندە . بۆ وێنە گۆران دەڵێ :

**راکشا بووم لەسەر پشتم**
**دۆکتۆرە (کە) م**
**ماری شێرپەنجەی دەکوشتم**

( گۆران ، ل ـ 221 )

**یاخود دەڵێ :**

**« کە نیشکە جوانە (کە) بۆچی فریبی حوسن و جەمال هەڵت ئەداتە سەمایی تەکەببورو عەظەمەت »**

( ل ـ 70 )

بۆ (کۆ) کردنەوەشی گۆران دەڵێ :

**« جۆگەی ئاوە (کە) تیایا فەتیس ماو**
**هەرئەڕوون ناکەن پێچی شاخ تەواو »**

( ل ـ 127 )

5 ـ هەندێ جار وەك پاشبەند کە دەلکێ بە کۆتایی ناوەوە یا ئاوەڵناوەوە ناوێکی نوێ دروست دەبێ . زۆر جاریش دوور دەبێ لە ناوە بنەڕەتیەکانەوە . بۆ وێنە گۆران دەڵێ :

**« سەرپۆشی (لووتکەی) بەفری زۆر سپی**
**بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کپی »**

( ل ـ 127 )

6 ـ هەندێ جار ئەم پاشبەندە کە باسمانکرد بۆ گچکە کردنەوەو خۆشەویستی بەکار دەهێنرێ . بۆ وێنە :

پەل : پەلکە

چەش : چەشکە

بەرۆژ : بەرڕۆچکە

یاخود دەڵێ :

**« سەر دەمێك بوو دنیای گیانم تاریك و چۆڵ بوو**
**کام ( بەڕۆچکە ) ی گەرمە دڵم چەشنی سەهۆڵ بوو »**

(ل ـ 42)

تێبینی : لێرەدا (بەرڕۆژ + کە) = (بەرڕۆژکە = بەرڕۆچکە) .

7 ـ هەندێ جار ئەویش کەمە وەك ئامرازی پرپیۆزیشن بەکار دەهێنرێ . گۆران دەڵێ:

**«كام پياو ماقوول، كام كەورە**
**(كە) بەرزيى جێى ژوور هەورە»**
(گۆران، ل ـ 84)

ياخود دەڵێ :
**(كە) (لە) گيان سەرچاوەى دڵ**
**سەر هەڵئەدا قوڵە قوڵ**
(گۆران، ل ـ 89)

8 ـ لە چوار چێوەى (پرس)دا دێ، ئەميش هەر تەنيا لە پەخشاندا بەر چاوم كەوتووە، ئەگەرچى گفتوگۆ هەميشە لەهى شيعر ڕاستو ڕەوانو بێ تەكليف ترە .

9 ـ بەواتاى تەرتيبى وەك بڵێت : (كتێبێكى ترم كرى) دەڵێت : (كتێبێكى (كە)م كرى) . ڕاناوى (كە) لە ڕستەى ئاوێتەدا : (وەختێ كە (كە) لە ڕستەى ئاوێتەدا بە ڕاناو سەر ژمێر دەكرێ ئەگەر هاتوو توانى وەك (ئاوەڵناو) ڕۆڵى خۆى بەرامبەر بە (ناو) ببينێ . لێرەدا بە تەماى ئەوەين كە جۆرەكانى جودا بكەينەوە : ـ

أ ـ (كە) لەبرى (ئاوەڵناو) يا شان بەشانى هاتووەتە ناوەوەو كردەوەكەى ياخود دەورى لە هەڵدانى ناوونيشان بەدەرنييە . بۆ وێنە قانع دەڵێ :
**«چوونى منى بێچارە لەبۆ مەعبەدو مزگەوت**
**بۆ ديتنى ميحرابە (كە تەشبيهە بە ئەبرۆت) »**
(ل ـ 65)

لە جێگايەكى ديكەوە قانع دەڵێ :
**« مانع ، كە وەها قانعە بەم بەختە ڕەشەى خۆى**
**چون نيسبەتى هەس ، بەختى ڕەشو نوختەيى هيندوت »**
( ل ـ 66 )

لە لايەكى ديكەوە قانع دەڵێ :
**ئۆستادى قەدەر ڕەسمى قەدى تۆيە لە دەسيا**
**بۆيە كە وەها لەت لەتە پەرگارى هەموو شۆخ .**
( ل ـ 71 )

گۆران دەڵێ :
**« تەصادوفەن كە جوانيت ، جەمالى بێوێنەت**
**بەرامبەرى نەزەرم ناگەهان تەجەسومى كرد »**
( ل ـ 73 )

ب ـ جێگەدارى ئاوەڵناوە فرەيزە يان وەكو (ئەو) دەور ببينێ . بۆ وێنە گۆران دەڵێ :
**( كە نيوە زەردەخەنەى نازو عيشوەيى گەرمت )**
**بە دزى لەعلەوە گرتى خەطێكى موروارى »**
( ل ـ 73 )

لە لايەكى ديكەوە دەڵێ :
**« ئەو مەحموود جەودەتەى ( كە قيبلەى هيوابوو )**
**ئەو مەحموود جەودەتەى قەلابوو پەنا بوو »**
( ل ـ 91 )

لە لايەكى ديكەوە دەڵێ :
**« كوڵم ( كە ميوەيەكە ئاڵو مزرى سەر لقى لەش )**
**وە نەرمى سينە كە لانەى خەوێكى يەزدانى »**

ج ـ جێگاى ناوە سەرەكييەكەى ڕستە بگرێتەوە ، بۆ وێنە گۆران دەڵێ :
**« ( ژنەكە ) گەوهەرى سەرتاجى ئيحترامە ، ژنە :**
**بە نووكى نەشتەرى ئەڵماسى تيژى عيشقو غەرام »**
( ل ـ 74 )

ء ـ گرتنەوەى جێگاى ( ڕاناوێ ) كە لە جێگاى ووشەى سەرەدابێ ، بۆ وێنە بێكەس دەڵێ :
**(من كە) خاكى پاكى كوردستانى نازدارم ببێ**
**چى لە قەطعەى ئەوروپاكەم مولكى چينم بۆچييە .**
( ل ـ 9 )

ديسانەوە دەڵێ :
**« (من كە) خۆشاوى زەريفو شەربەتى مێوژم ببێ**
**نامەوێ شەمپانياو ئەسكەنجەبينم بۆ چيە »**
( ل ـ 9 )

هـ ـ گرتنەوەى جێگاى (بەركار) بۆ وێنە بێكەس دەڵێ :
**« خەڵقە پێم بڵێن : ( كەچى قەوماوە )**
**ئەم خەڵقە بۆچى ئەڕۆن ڕۆژ ئاوە »**

و ـ گرتنەوەى جێگاى (كارا) بۆ وێنە قانع دەڵێ :
**« ( كە دولبەر ) بادەنۆشىكا ، ئەبێ من خزمەتى مێوكەم**
**بەشەو ئاودێرى باخاتو بەڕۆژ دەفعى چلوچێوكەم »**
( قانع ، ل ـ 120 )

ز ـ گرتنەوەى جێگاى ديارخراو ياخود سەبجێكت :

قانع بۆ وێنه دەڵێ :

« **خەتای بەختە (کە من) دێوانەکارم**
**ئەگەرنا بەش بەحاڵم هۆشیارم**

لە جێگایەکی دیکەوە دەڵێ :

« **(کە من) ئۆستادی مەجنوونم لە عیلمی شێتی ئەمجا**
**لە کێوی نەجدەدا خۆشە کە لاقی بارەگا لێدەم** »

( ل - 134 )

ح - گرتنەوەی جێگای ( ناوە فرەیز ) : بۆ وێنە قانع دەڵێ :

« **شەپۆلی لەشکری یۆنان ، کە خاکی ( مادی ) یەغماکرد** »

( ل - 68 )

ط - گرتنەوەی جێگای ( ناوەرستە ) ی پریدیکەین ( دیارخەر ) : بۆ وێنە گۆران دەڵێ :

« **بەم جوانی‌یانە ( کە زینەتی بەهەشتی دنیان )**
**بەم جوانی‌یانە ( کە لە تۆدا هەموویان پەیدان )** »

(گۆران ، ل - 44 )

قانع‌یش دەڵێ :

« **گوڵ ( کە مەیلی دولبەری‌بێ ) مشتەری پەیدا ئەکا**
**دڵ ( کە کەوتە عیشق بازی ) زاهدی ڕیسوا ئەکا** »

( قانع ، ل - 46 )

لە جێگایەکی دیکەوە قانع دەڵێ :

« **کچ ( کە خوّی نەرمو لەتیف‌بوو ) چ تەوەقوع بە حیجاب** »

( ل - 58 )

**ئامرازی (کە) لە ڕستەی ئاوێتەدا :**

وەختێ (کە) بە ئامرازی نێو ڕستەی ئاوێتە لە قەڵەم دەدرێ ، ئەگەر هاتوو لەو مەرجانەی کە لە (کە) ی ڕاناودا باسمان‌کردن بە دەربێ‌و جێگای ئامرازی پریپۆزیشن‌و دەوری ڕواڵەتی‌ی هی پرس‌و پاشبەندی ناسراوی‌و هی ناو دروستکردن نەگرێتەوە . بە شێوەیەکی ڕوون‌ترو ئاسان‌تر بۆمان هەیە بڵێین ئەگەر (کە) ی ڕستەی ئاوێتە لە بری ( ئاوەڵکار ) یان ( ئاوەڵکارە وەچەڕستە ) هات ئەو وەختە بە ئامرازی ( پەیوەست ) لە قەڵەمی ئەدەین . بۆ وێنە قانع دەڵێ :

« **تۆ پزیشکی حاڵزان‌و ، من نەخۆش‌و دەردەدار**
**چا کە ئینسافت‌بێ ، ( کاتێ کە خۆم خستە پەنات** »

( ل - 65 )

لە لایەکی دیکەوە قانع دەڵێ :

« **مەنازە قەت بە فیرعەونی ، ئەمە میسرێکی زۆر کۆنە**
**( کە ئەمڕۆ هاتە ژێر حوکمت ) ئەبینی دادو دیوانت** »

( ل - 67 )

گۆران دەڵێ :

« **هووەیدایە لە ڕەنگی تاڵی دەشتت**
**( کە دائیم پیشەتە ) قەتڵو جینایەت** »

( گۆران ، ل - 68 )

لە جێگایەکی دیکەوە گۆران دەڵێ :

« **کام پیاو ماقووڵ ، کام گەورە**
**( کە بەرزیی جێی ژوور هەورە )** »

( ل - 84 )

لە لایەکی دیکەوە گۆران دەڵێ :

« **ناو ڕێگا تەق تەق لادێ بەردی زل**
**کە هێشتا گەردوون پێی نەداوە تل** »

( ل - 128 )

هەروەها دەڵێ :

« **کە لەناو کەپران جڵەویان گرتین**
**زەردەی لووتکەکان پاش‌و پێش ئەفڕین** »

( ل - 147 )

**ناواخنی ڕستەی ئاوێتەی (کە) :**

بە پێی ڕواڵەتی ئەم تایتڵە پرسیاری سەر دەردەهێنێ ئەویش ئەمەیە : ئایا ، ئەو ڕستە ئاوێتەیەی کە بە هۆی (کە) وە دروست دەبێ توانای وەرگرتنی وەچەڕستەی ناواخنی هەیە ؟! شایەنی باسە ئامرازی ڕستە لێکدان لە زمانی کوردیی‌دا کەم‌نین‌و بە هۆیانەوە توانای ئەوە هەیە دوو ڕستەی ساکار یاخود پتر بە یەکەوە بەند بکرێ ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەوە پەیوەست‌کردنی ساکاریّ یاخود پتر لە ساکاریّ بە ( وەچە ڕستە ) و ( سەرە ڕستە ) وە ئاسانە . هەریەکێ لەو ئامرازانەش بە پێی جێگاو شوێن‌و ڕێگەو کارو ئەرکی تایبەتی خۆی بۆ مەبەستی ڕستە لێکدان بەکار دەهێنرێ .. بە بۆنەی خستنە ڕووی چەند ئامرازێ ئەم شیعرانەی گۆران بە نموونە دەهێنینەوە .

« **بۆ وەها ئەلوێ ، (ئیتر) خامۆش بم**

**با لە مەیدان ونبم (و) فەراموش بم »**

لە جێگایەکی ترەوە گۆران دەڵێ :

**« لە هەچ باخێ گوڵێکی سوورم دیبێ**
**بۆی چووم هەزار درک لە پێم چەقیبێ**
**(بەلام) تەبیعەت هەرگێزاو هەرگیز**
**بێ رووناکییە بێ بزەی ئازیز »**

لەم وەرگرتانەدا (ئیتر) و (و) و (بەلام) ئامرازی ( پەیوەست ) ن ، بەلام هەریەکەیان لە جێگایەکداو بە مەبەستێ !!. ئەمەی سەرەوە نەختێ رووناکیبوو دەربارەی چۆنیەتی ڕستەی ساکارو لێکدانیانەوە هەرهەمان دەستوور ئەو جۆرە ئامرازانە توانای دروستکردنی ڕستەی ناواخنیان هەیە .

دلداری شاعیر بە سەلیقەی زمان دوو ڕستەی ساکاری لە ( سەرە ڕستە ) کە لێکداوە ، بۆ وێنە دلدار دەڵێ :

**« لە نێو ئەم باخە بێ جێگەی ( کەتۆم لێدیت ) لە هاوینا**
**لە پەلکی تازە پشکوتووی نەژاکاوی گوڵی نەسرین**
**( کراسێکی سپی بێگەرد دروستکە ) (شەنگەو دامەن شۆڕ )**
**( لە بەرکەو ) ( زوڵفی زێڕینت بە سەریا بینە خوار چینچین ) »**

( کاروانی شیعر ، ل ـ 110 )

( وەچەڕستە ) لێرەدا ( کە تۆم لێدیت ) ە . ( سەرەڕستە ) یش ڕستەی ( کراسێکی سپی بێ گەرد دروستکە ) یەو ئەوانەش کە پێوەیوبەندکراون ئەوانی دیکەن کە خەت هاتووە بە ژێریانا .. لەم نموونەی ( هەردی ) دا دوو ڕستەی ساکار لەگەڵ وەچە ڕستەدا لێکدراون یەك بە شوێن یەکەوە ئەوجا ڕستەی سەرەکی هاتووە ، بۆ وێنە تەماشا :

**« ( کە جۆگا تێکەلی چەم بێو چەمیش تێکەڵ بە دەریابێ )**
**( شەمالیش پڕ لە هەستی بێو ) نییە شت تاك و تەنیابێ »**

( کاروانی شیعر ، ل ـ 138 )

وەچە ڕستەکە لێرەدا « کە جۆگا تێکەلی چەم بێ » یە . ڕستەی ساکاری یەکەمو دووەمیش ئەوانەن کە یەك لە دوای یەکەوە هاتوون بە هۆی ئامرازی پەیوەستەوە لێك دراون . بەلام ئەو ڕستەیەی کە ماوەتەوەو خەتی بەژێردا نەهاتووە سەرە ڕستەیە . ئەمە نموونەیەکی دیکەیە کە ڕستەیەکی ساکار لەگەڵ ( وەچە ڕستە ) دا لێك دراوەو یەکێکیش لە گەڵ هی سە،ەکیدا ، بۆ وێنە مامۆستا هەردی دەڵێ :

**« ( کە کێوو کەژ بکەن ماچی هەموو ئاسمانی بەرروشین )**
**( شەپۆلیش هەروەکو دلدار لەمل یەك دەستی ئالابێ )**
**( ئەبەد نابێ کە خوشکی گوڵ برای دەرکات ) و لێی دووربێ ) »**

( کاروانی شیعر ، ل ـ 139 )

ئەمەی خوارەوە نموونەیەکی دیکەی ڕەوانە کە جگە لە ( وەچە ڕستە ) و ( سەرە ڕستە ) ، چەند ڕستەیەکی ناواخنی تێدایە پەیوەست کراون بە وەچە ڕستەو بە سەرە ڕستەوە . بۆ وێنە هەردی دەڵێ :

**« دەسا تو حەققی ئەم خاکەی کە خاکی ئەشکەو خوێناوە )**
**( هەتا خوا هێزی پێ داون ، هەتا دنیا خرۆشاوە )**
**( هەموو پڕ دەم بقیژێنن کە ئێستیعماری ئینگلیسی )**
**( برووخێ ، تەفرو توونابێ سەرو فەسالی نەگریسی )**
**( برووخێ تەختو تاراجی ، بتۆپێ نۆکەری پیسی ) »**

( کاروانی شیعر ، هەردی ، ل ـ 142 )

بوونی (کە) وەك ئامرازی لێکدراو :

(کە) وەك ئامرازی پەیوەست لە پێشیەوەو لە کۆتاییەوە بە رووالەتی جۆراو جۆر ، جۆرە بەندێ وەردەگرێو لە گەڵ هەندێکیاندا جۆش دەخواو لە گەڵ هەندێکی دیکە شیاندا بە نزیك بوونەوەو شان بەشانی یەك هاوکاریی یەکتری دەکەن . ئەو بەندانەش کە ئەو جۆرە هاوکاریانە دەکەن وەك ( چۆن ـ ، هەر ـ ، ـ چی ، ـ وا ، ـ وەختێ ، ... ) و بە هۆی هەریەکێکیانەوە یا ئامرازێکی لێکدراو دروستدەکرێ ، یا زۆر بە نزیك یەکەوە دەبن بە جۆرێ کە کار دەکەنە سەر کاری بنەڕەتی یەکتری . ئەمانەش هەندێ لەوانەن :

**چونکە = ( چون + کە )** :

أ ـ ( چونکە ) خۆی بە تەنیا واتای ( لەبەر ئەوە ) دەدات ، واتە (هۆ) = کەی دەردەخات لە بنەڕەتدا چونکە پێك هاتووە لە (چون) کە واتای (وەك) دەداتو لە (کە) کە هەمە جۆر وێنەکانیان وەرگرت ، بۆ وێنە بێکەس دەڵێ :

**« باسی مەحزوونیو کەساسی خۆت نەکەی توخوا وەتەن**

**(چونکە) بەو باسە برین‌و زامەکەم ئەکولێتەوە »**
**( بێکەس ، ل ـ 5 )**
مەحوی دەڵێ :
**« دەرکی صەعبە ، دەم مەدە « مەحـوی ) لە ئەسـراری دەمی**
**(چونکە) بۆ (لاشێ) « هەر سەعیەك بکا دەڕوا بەلاش »**
**( دیوانی مەحوی ، ل ـ 151 )**
دیسانەوە بێکەس دەڵێ :
**« بێ ناوونیشان هەمیشە دیلە**
**چونکە دوو دڵ‌و خام‌و بەخیلە »**
**( دیوانی بێکەس ، ل ـ 51 )**
ب ـ وەختی وەهاش هەیە کە (کە) لە گەڵ (چونکە) دا بە جووتە بەرودوا دێنە نێو ڕستەوە بەلام لە هەردوو حاڵەتدا واتە : ( کە + چونکە ) یاخود ( چونکە + کە ) ، هەر یەك واتا دەدەن هیچ لە کارەکە تێك نادەن‌و ئەو واتایەش هەر واتای ( چونکە = لەبەر ئەوە ) یە ، تەنیـا ئەوە نـەبێ کە لە ڕووی زمانەوە سەر لەبەر نییە ! بۆ وێنە ئەحمەد موختار جاف دەڵێ :
**« محەقەق دڕك‌و داڵی دەشتی بەکراوایە گوڵنارم**
**( کە چونکە ) جێگەی نازو غەرامی حەزرەتی لەیلە »**
( دیوانی ئەحمەد موختار جاف ، چاپخانـەی هەولێر ، ل ـ 28 ) بۆ جۆری دووەمیشیان ئەحمەد موختار دەڵێ :

**« لە وەختێکا کە من نەرگس ئەبینم زۆر لەلام خۆشە**
**( کە چونکە ) ئەو گوڵەش نەختێ شەبیهی چاوی دڵدارە »**
( هەمان سەرچاوە ، ل ـ 37 )
**هەرکە = (هەر + کە) :**
(هەر) خۆی بە تەنیا لە نێو فـرەیزداو بـە پێی چۆنیی جێگای واتای جۆراوجۆر دەدا بەوێنە : ( هەر دووان ) ، واتای : ( تەنیا دووان ) دەدا . ( هەر دووا دەکەوێ ) ، واتای : ئەوە دەدا کە ( هەمیشە دەکەوێ ) . (هەر) لە زاری هەورامانیدا جگە لەوەی کە واتای هەمیشەی هەیە ، واتای کەروبێ عەقڵیش دەدا کە (هەر) لە گەڵ (کە) دا یـەك بە شـوێن یەکـەوە یەك دەگرن‌و (هەرکە) دروست دەکەن ( بە هەردووکیانەوە ) واتای (وەختێ) دەدەن . بۆ وێنە بێکەس دەڵێ :

**« ( هەرکە ) ڕۆژ ئاوابوو ئیتر بۆ عەرەق سمکۆڵ ئەکەم**
**وەك وڵاخێ بێتە وەختی کاوو جۆو ئالیکەوە »**
( دیوانی بێکەس ، ل ـ 89 )
**کەچی = ( کە + چی ) :**
(چی) هەروەك ئامراز بۆ پرس بەکارهێنراوە بە وێنە وەك بڵێین : چی ؟ لە کاتێکدا یەکێ قسەیەکمـان بۆ دەکـا یاخـود پرسێکمان لێ دەکا بەلام چاك گوێمان بۆ شل نەکردووە . یا بە هەر هۆیەکی دیکەوە داوای لێ دەکەینەوە بـە ئامـرازی پرسی (چی ؟) . بەلام وەختێ (چی) لەگەڵ (کە) یدا یەك ئەگرێ‌و وەك لێکـدراویان لە کـاردا لێدێ واتـایـەکی نـوێ هـەروەك رواڵەتێکی نوێیان پەیدا کردووەو دەدەن ئەویش نزیکی واتای (بەلام) ە . بۆ وێنە هێمن دەڵێ :

**« ئەمن دەمکوت لە دنیا تا بمێنم**
**لە بەر کەس ئەستەمە سەر دانەوێنم**
**(کەچی) ئێستا لە داوی بسکی تۆدا**
**گرفتاری گوڵم ، موو ناپسێنم »**
**( تاریك‌و ڕوون ، ل ـ 129 )**
بێکەس دەڵێ :
**« لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم**
**کەچی هێشتا هەر دیل‌و ڕەنجەڕۆم »**
( دیوانی بێکەس ، ل ـ 24 )
کاکەی فەللاح دەڵێ :
**« بەسەر ژمێر خۆی یەکێکە لەبەرچاو**
**(کەچی) پەلکە زێڕینەیە بە هەناو »**
**( کاروانی شیعر ، ل ـ 143 )**
ئەحمەد موختار جاف دەڵێ :
**« عەجەب سرپێکە بۆچ بولبول خەریکی ناڵەیی زارە**
**(کەچی) مەحرورمە ئەو دایم ڕەفیقی خونچە هەر خارە »**
( ئەحمەد موختار جاف ، ل ـ 37 )
**کەوا = (کە + وا)**
(وا) خۆی بە تەنیا واتای (بەوجۆرە) دەدا بۆنموونە وەك بڵێی (واهات) و (واچوو) بەلام کەووتت ( وا بەسەربانەوە ) واتای ( بەسەر بانەوەیە دەدات . وەختێ (وا) لەگەڵ (کە) دا لە یەك ئەدەن‌و (کەوا) وەك لێکدراوێ یا وەك کەوتنـە شوێن

یەکێ ڕواڵەتێکی نوێ دروست دەکەن جگە لەوەی کە واتایەکی نوێ‌ش دەدەن بە دەستەوە . ئەم واتا نوێ‌ - یە ناوونیشان هەڵدەرو تاریف - دەرە کە وەك فرەیزی (بیانی) دەکەویتە دوایەوە . بۆ وێنە وەفایی دەڵێ :

**« تابی سەری کوڵمت بوو (کەوا) زولفی بەبادا**
**یا ڕۆژی ویصالت شەوی هیجرانی وەلادا »**

( دیوانی وەفایی ، ل - 5 )

لە لایەکی دیکەوە دەڵێ :

**« ئەو زارە (کەوا) هەر بە تەبەسوم هەیە خاڵێ**
**پیریکە دەڵێ گا لە بەقا گا لە فەنادا »**

( هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە )

دیسانەوە دەڵێ :

**« هەر تارە (کەوا) مەسکەنی باری دڵو ڕۆحە**
**صەد ڕۆحی بە بادا کەداو پەرچەمی بادا »**

( هەمان سەرچاوە ، ل - 5 )

بەم بۆنەیەوە وەرگرتەیی لە هۆنراوەکانی پیرەمێرد دەڵێ :

**« ئەزانی (کەوا) پێنج و دوو ڕۆژە دەوری**
**کە ناوی نەما نامێنێ کەس لە دەوری »**

( دیوانی پیرەمێردی نەمر ، ل - 239 )

لە لایەکی دیکەوە دەڵێ :

**« (خۆزگە) ئەوانەی بە فەساڵو بە فیشاڵ ئەدوون**
**لەو تیرەیە ئەبوون (کەوا) کەوانیان دیار ئەبێ »**

( پیرەمێردی نەمر ، ل - 79 )

**کە وەختێ = ( کە + وەختێ ) :**

(وەختێ) خۆی بە تەنیا پێك هاتووە لە (وەخت) + (ێ) کە ووشەیێ (وەختێ) ی دروستکراوە . (ێ) ڕاناوی تاکی نەناسراوە .(وەختێ) بە واتا واتای (کاتێ) دەدا . (کە) ش لە گەڵ (وەختێ) دا هەر هەمان واتا دەبەخشێ . کەوابوو (کە) و (وەختێ) پێکەوەو بەم جۆرە ( وەختێکە ) یاخود ( کەوەختێ ) واتای (کاتێ) دەدەن . بۆ وێنە ئەحمەد موختار جاف دەڵێ :

**« بە میراتی لە دڵمۆ داخی ڕەش بۆ لالە جێ‌ماوە**
**(کەوەختێ) سەوز ئەبێ بۆیە وا ناوجەرگی سووتاوە**

( ل - 29 )

لە لایەکی دیکەوە دەڵێ :

**« ( وەختێکە ) ئەکەی چەشنی نەسیم لەنجە بەرەو ماڵ**
**ئەگریجەیی تەڕ پەخشە لەسەر کوڵمو خەتو خاڵ »**

( ل - 33 )

بێکەس - یش دەڵێ :

**« بەلام (کەوەختێ) مانگ هەشتو نۆی بێ**
**کیسەی چۆڵ ئەبێ هەر خۆی بەخۆی بێ »**

( بێکەس ، ل - 58 )

**کەی = (کە + ی) :**

لە (کەی) دا (ی) بە (کە) وە بەستراوەو پێوەیو بەند بووە بە جۆری کە جۆشیان خواردووە . (کەی) واتای (ناکا) یا (نییە) ی تێدایەو زیاتر دیمەنی سەرسوڕمانی پێوەیە بۆ وێنە کە کاردۆخی )کەی) لە پارچە شیعرەکەی‌دا بەکار دەهێنێ‌و دەڵێ : ( کەی شیعرە ! ) . مەبەستی ئەوەیە کە لە شیعر (ناکا) یاخود ( شیعر نییە ) بە واتای شیعرو ڕواڵەتەکانی !

أ - (کەی) بە واتای (ناکا) یا نییە :

**« (کەی) شیعرە برا میعرە بە کێشانو بە پێوان**
**(کەی) شیعرە ئەوە هیچە بە ئایین‌و بە ویجدان »**

یاخود دەڵێ :

**« (کەی) شیعرە لەلای زیرەك‌و زاناو ئەدیبان**
**(کەی) نافعی دەردە بە قسەی ژیرو تەبیبان**

( دیوانی کاردۆخی ، ل - 30 )

ب - (کەی) بەواتای (وەختێ) :

( تاکەی ئەوە وادەبێ واتای ئەوە دەدا
کە ( تاچ وەختێ ئەوە وا دەبێ ؟ ) .

( هەرکەی هات ) ، واتای ( هەر وەختێ هات ) دەدا .سەرچاوەکان :

1 – تەماشای کتێبی « گرامـاری زمانی کوردی » دوکتۆر مەکارۆز بکە .

Akurdish Graminiar . Deseriptive Analysis of the kurdish of sulaminiya , IRAQ . by Ernest . N . Mccarus . American CounciL of Learned societies . New york , 1958

2 – تەماشای کتێبی لێکۆڵینەوەی زارەکانی زمانی کوردی ، دوکتۆر مەکەنزی بکە .

Kurdish Dialect stu dies — L . By

D . N . MACKen zie Lecturer in
Iranian Language , school of
oriemtal and African studies .
Oxford university press , Newyork
Toront , 1961 .

3 — ڕێزمانی کوردی ـ چاپخانەی کامەران ـ سلێمانی ، 1960 م .

4 — سـەرەتاییـك لە فیلۆلۆژیی زمانی کـوردی ، چاپخـانـەی مەعاریف ، بەغدا ، 1973 ـ محەمەد ئەمین هەورامانی .

5 — د . ئیبراهیم عەزیز ـ ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو خواز لەگـەڵ ڕستەی شـوێنکەوتـووی دیارخـەری لە دیالێکتـە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا . بەغدا ـ 1980 ، چاپخانەی ( دار الحریة ) .

6 — ڕێزمانی ئاخاوتنی کـوردی بە پێی لێکـۆڵینەوەی لیـژنەی زمان و زانستەکانی ، چاپخانەی کۆڕ ، 1976 .

7 — زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراووردا ، چاپخانەی ( المؤسسة العراقیة للطباعة ) بـەغدا ، 1981 ـ محـەمەد ئەمین هەورامانی .

8 — دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جـاف . چاپی دووەمـین ، چاپخانەی هەولێر . 1966 ، گیوی موکریانی ) .

9 — گوڵ ، لە شیعری شاعیری کورد حەمدیدا . لە چاپخانەی مەعاریف ، 1974 ـ دوکتۆر مارف خەزنەدار .

10 — حەمە عەلی مەدهۆش ـ یانەی دڵان ، چاپخانەی عەلاء ، بەغدا ـ 1982 .

11 — دیوانی وەفایی ( میرازا عەبـدول ڕەحیمی سابـڵاخی ) لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداخی ـ چاپخانەی کۆڕ ، بەغدا ، 1978 .

12 — کاروانی شیعری نوێی کوردی ، بەرگی یەکـەم ، حەمـە حەمە ئەمین قادر « کاکەی فەللاح » چاپخانەی کۆڕ ، 1978

13 — دیوانی قانع ، کۆکردنەوەی بورهان قانع ـ چاپی یەکەم ، لە چاپخانەی زانکۆی سلێمانی لە چاپ دراوە ، 1979 .

14 — دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی ، لێکۆڵینەوەو ساخکردنەوەو لە سەر نووسینی دوکتۆر مارف خەزنەدار ، لە چاپخانەی (دار الحریة) لە بەغدا 1977 لە چاپ دراوە .

15 — دیوانی مەحـوی ـ لێکدانـەوەو لێکۆڵینـەوەی مەلا عبـد الکریمی مدرس و محمدی مەلاکەریم ، چاپخانەی کـۆڕ ، 1977 ، بەغدا .

16 — دیوانی کاردوخی ، بەشی یەکەم ، محمد امین کاردۆخی ، لە چـاپخانـەی (دار الحریـة) لە سـاڵی 1978 لە بـەغـدا لە چاپدراوە .

17 — سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یـەکەم ، دیـوانی گۆران ، محمدی مەلا کریم کۆی کردوەتـەوەو ئامـادەی کردووەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە . لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری ساڵی 1980 لە چاپدراوە .

18 — دیوانی بێکەس ، محمـدی مەلا کـریم ڕێکی خستووەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە ، لە چاپخانەی شەفیق لە بەغدا 1970 لە چاپ دراوە .

19 — دیـوانی شاهـۆ ( مەلا حـەسەنی قـازی ، کۆکـردنەوەو ڕێکخستنی ـ محمد امین کـاردوخی بەرگی یـەکەم ، لە سلێمانی لە چاپخانەی ڕاپەڕین ساڵی 1976 لە چاپدراوە .

19 — دیـوانی شاهـۆ (مەلا حـەسەنی قـازی ، کۆکـردنـەوەو ڕێکخستنی محمـد امین کـاردوخی ـ بەرگی یـەکـەم لە سلێمانی لە چاپخانەی ڕاپەڕین ساڵی 1976 لە چاپ دراوە .

20 — محمد رسول (هاوار) ـ پیرەمێردی نەمر ، لەچاپخـانەی (العانی) لە بەغدا ساڵی (1970) لەچاپدراوە .

21 — هێمن ـ تاریك و ڕوون ـ ساڵی 1974 .

22 — زمان و ئەدەبی کـوردی ، بۆ پـۆلی یەکـەمی ناوەنـدی ، چاپخانەی (حکومەت) ، بەغدا 1975 .

23 — زمـان و ئەدەبی کـوردی ـ بۆ پـۆلی چوارەمی ئـادەیی ، چاپخانەی «الجبوری» بەغدا ، 1977 .

24 — زمـان و ئەدەبی کـوردی ، بۆ پـۆلی پێنجەمی ئـامادەیی چاپخانەی (الشعب) ، 1976 بەغدا .

25 — د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم (ناو) چاپخانەی کۆڕ ، ساڵی 1979 لە چاپدراوە .

26 — مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەرگی یەکەم ، چاپی دووەم ، چاپخانەی مەعاریف ، 1971 مامۆستا عەلا ئەدین سەجادی

27 — بەرگی دووەمی ( شیعرو ادبیاتی کوردی ) رفیق حلمی ـ چاپخانەی (الشباب) ساڵی (1956) لە بەغدا لە چاپدراوە .

28 — دوکتۆر جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، ساڵی 1974 لە ئەڵمانیا ئۆفسێت کراوە .

# زمانی خۆ بزانە



ئەمینێ ئوسمان

مە کوردا نڤیسینەبو دا زمانێ خو پێش بێخین و دەولەتمەند بکەین و ئاخفتن و زمانێ بازاری (عامی) ژ یێ نڤیسینێ جوداکەین . ژبەرهندێ نهو گەلەك گوتن یێدهەین ددروست نینن و لگەل هندێژی هەموکەس بکاردهینن ، ژبەرکو یێدکەتینە سەر ئەزمانێ وان .

ئەڤرو ئەم یێ بەرێ خو ددەینە نڤیسینێ و قوناغا مە یا بەرکەتي و نازکە ، ژبەرهندێ دڤێت ئەم دهشیاربین و ئاخڤتنا بازاری بمجدی ڤەوژێرین ژناڤ زمانێ نڤیسینێ دا ئەوژی وەکو هەمو زمانێد پێشکەڤتی ریا راست بگریت و بنەجهـ ببیت .
ئەز وەسا دبینم کو یافەرە هندی ژمە بهێت وان خەلەتییا دیارکەین یێد کەتینە سەر زمانێ خەلکی و وەنەکەین جهێ خو بگرن د زمانێ نڤیسینێدا .

من هندەك گوتن یێد لدویڤ بیرو باوەرێت خو دروستکرین و راستییا وان یا ئینایەدەر و هویڤیا من ئەوە کو هەر کوردەکێ شارەزا لخوبدەت (یحاول) کو ڤی کارێ پیروز بکەت و دانیتە پێش چاڤێد خویندەوارا دا ژ خەلەتییا دویر بکەڤن و زمانێ نڤیسینێ یێ پاك و پێشکەڤتي بیت .
لڤێرە من هندەك بیژە یێن ئینایین و لدویڤ زانینا خو لەنگیا وان یادیارکری هویڤیدکەم لهەر دەراڤەکێ بدەست من بکەڤیت هێژ بینمە پێش .

* - بەلەڤاژی -
لمال دبێژن - ئەو ئاخڤتن یابەلەڤاژییە - ئانکو یاکرێتە ئان دجهدانینە . ئەم دزانین (ڤاژی) نیشانا هندێ ددەت کو رویێ ژناڤدا یێهاتییە بەری . (بەرەڤاژی) ئانکو بەرێ تشتي یێ ڤاژییە . ژبەرهندێ یادروست (بەرەڤاژی) یە نەکو (بەلەڤاژی) . دیسا مە گوهـ لێدبیت هندەك دبێژن ئان دنڤیسن (بەروڤاژی) ئەوژی دروستنینە ژبەرکو وەسا دهێتەپێش ژلایێ زمانیڤە (أ) - (بەر + و + ڤاژی) (ب) - (بەرو + ڤاژی) . هەردو ژی دجهدانینن . یائێکێ ئانکو (بەر لگەل ڤاژی) هەروەکو بێژین (عەلي و تەمەر) ، و یادوێ هەروەکو ئێك ناڤێ وی (بەرو) یە یێڤاژییە .
ژبەر تشتێهاتییە ئاشکەراکرن (بەرەڤاژی) دروستترە .

* - بکێر . (کێیا سڤك) .
ئەم دبێژین فلان تشت ئان مروڤ بکێرناهێت ئان نەهاتییە . د بنیاتدا (کار) ە یابوویە (کێر) . بکێرنەهاتن ئانکو بێ وج ، ئان نەهێژایە .
بو زمانێ نڤیسینێ و دروستیي یافەرە (کار) دانین ژبەرکو یادروستە و ئەوە بنیات و (کێر) ئاخڤتنا بازارییە و دەڤخوارییە . دێبێژین (فلان تشت ئانمروڤ

بکارناهێت) . ئان (ئەڤ کراسە یێ کورتە بکار من ناهێت) .

* - بکەکەنی :
ئەڤ گوتنەو گەلەکێد دی وەکو (بکەغار ، بکەگری .. هتد) ب بەرفرەهی و مشە هەرروژ مە گوهـ لێدبن . بکار ئینانا ڤان بێژەیاو بڤی رەنگی دجهدا نینەو لەنگییەکا ئاشکەرایە یازمانی . (بکە) فەرمانا کرنێیە ئەگەر مە ب (کەنی ، گری) ڤە نوساند نیشادانێت گوتنێ سەر و بن دکەت و رێکناکەڤیت لگەل ئارمانجا گوتنا مە . ژبەرکو ئەم وەسا هزردکەین ئەگەر مە گوتە ئێکی (بکەگری) ئارمانجا مە ، فەرمانە بو مروڤێ ئەم لگەل دئاخفین دا (بگریت) . بەلێ ژلایێ دروستی و رێیا زمانیڤە وەسا نیشاددەت کو ئێکی کزکریوکا دگەرویدا و ئەم یێژێ دخازین کو بکەتە گری .

ئەڤ (کرن) ە هەمو بو ڤەگوهازتنێنە ژحالەکی بو یێ دی هەروەکو منگوتی ئەگەر مە گوتە ئێکی (بکەغار) ئەو مروڤ یێ برێ چیت چ سڤك چ هێدیو مە ژێ دڤێت وێ رێڤەچونێ وەرگێریت بکەتە (غار) . دیسا هەمووکەس دبێژن (من کرە ترانە جامێر چزوی تە باوەرکر) ئانکو سوحبەتەکا مجد من گوهارت و کرە ترانەو یاری .
ئەڤجارە یادروست ئەوە ئەم بێژین (بگری ، بکەنە ، غاردە وەکو بازدە .. هتد) وکرنا وان یا بوری (گری ، کەنی ، غاردا ، بازدا .. هتد) نەکو (کرەگری ، کرەکەنی ، کرەغار) .

* - تیڤارێز :
ئەڤ بێژە دهێتە گوتن بو دیارکرنا لدوی ئێکیێ ( تسلسل ) . بنیاتێ وێ ژ (دویڤەرێز) ێیە ئانکو رێڤە چونەك ئان راوەستانەکا ئێکی لپشت ئێکی وەکو لەشکری ئان کاروانەکی ئان مێرویا . ژبەرهندێ یا دروست ئەوە بێژین (دویڤەرێزا مێرویا) نەکو (تیڤا - تیڤە - رێزا میرویا) .

* - چون ، چەوا :
بو نیشادانا پسیارێ یا (چ رەنگ ، حال) کورد دبێژن (چون - چەوا - چاوا - چطوڤ - چتور - کوطوڤ - کو) .

نهو ئارمانجا مە ئەوە کو زمانێ نڤیسینێ هەمو کورد بزانن و ببیتەئێك . بو ڤی کاریو دروستی و بنەجهیا بێژێ دیارە (کو) ژ هەمویان بەلاڤ و بنەجهترە . ژ لایەکێ دیڤە (کو) دزمانێت ئندو ئوروپاییدا (qwe و qwo) هەر وی نیشادانێ ددەت .

* - حەوێل :
بو چاڤێت هەر ئێك بو لایەکی چوی ئانکو ڤێر دهێتە گوتن (یێ چاڤ حەوێلە) . حەوێل هەروەکو دیار ژ زمانێ عەرەبی هاتییە دناڤ کوردیدا و گوتنەکا نوییە . یا دروست و کەڤن دزمانێمە دا (ڤیرە) بو چاڤێت (خێل) یا دیسا دهێتە بکار ئینان .
دزمانێت ئندو ئوروپایێدا وەکو ئنگلیزی (VEER) و فەرەنسی (VIRER) باد ان و زڤرین و گهورینا لا نیشان ددەت .

* - دڤێت :
بادینی و کرمانج تێکدا دئاگەهدار نینن وەکو (ڤیان) و ژێ پەشیبێت وێ ددەنەکاری ، وەکو دبێژن ( تڤێت ، پێتڤی ، خوشتڤی .. هتد ) .
دبنیاتدا (دڤێت) ە ، دبیتە (ت) . هەروەکو دیار ژ لایێ رێیا دروست یا زمانیڤە ئەو گهورین یا دروستنینە . یا راست ئەوە بێژین ( دڤێت ، پێدڤی ، خوشدڤی .. هتد )
.

* - دەیك :
نهو یا بەلاڤ لدەمێ ئاخڤتنێ ئەوە کو (دەیك لشونیا (دایك) دهێتە گوتن ، بەلێ بنیات (دایك) ە . (دا) پێشگرە (دان و دانان) ددەتە دیارکرن . دزمانێد ئندوئوروپاییدا دیسا (Dhe) هەیە ، ئەوژی ئانکو (دان دانان) .

* - خشکوك :
مە گوهـ لێ دبیت ئان دبێژین (ئەڤ کچە یا خشکوکە بو دیارکرنا جوانیا وێ . ئەو دجهدا نینە ژبەرکو بنیاتێ (خشکوك) ژ ( خوش = چاك ، باش + کوك = پێکهاتی ) هاتییە .
خوشکوك ئان خشکوك دروستیا وێ بو دیارکرنا کارکرنەکا

(لبس) چاڤگره (جذاب) . ئەڤە ئانکو (انیق) . ژبەرهندی ئاشکەرایە کو (خوشکوك) دهێته گوتن بو مروڤەکێ جلك کارکری و چاڤگر (اناقه . انیق) هەروەکو مە گوتی ، بەلێ بو رویی گەشییی و شرینیا تشتی ئان مروڤا دڤێت بێژین (جوان) (جمیل) .

* - ژ - ل :

تێکشێلانەکا بەرفرەهـ یاهەی دئاخفتنا مەدا وەکو دبێژین ( لێ بپرسه - لێ گەرێ ) ^(ئانکو) ئاپێشیار ژێ بکەو ژێ ڤەبە . ژ لایێ رێیا زمانیڤە (ژ = من ، یا عەرەبی) و ( ل = ڤ ، یا عەرەبي ) بومە دیار دبیت ئەگەر بێژین (لێ بپرسه) ئێکسەر وەسا دێ زانین کو چاڤدێرێ لێبکە ئان گوهێ تە لسەر بیت . گەلەك جارا دهێته گوتن (تو لمە ناپرس جامێر) ئانکو تو ژ هندەك کەستیودی (نەکو مە بخو) ناپرس کانێ حالێ مە چیە ، ئان تو یێ ژ مە دویر کەفتیو چاڤێ خو نادەیەمە .

(ژێ بپرسه) ئان (ژ مه بپرسه) (پسیارکە) داخازا زانینا ئێکسەرە (مباشر) ، بەلێ (ل) لکارێ (لێ بپرسه) جهێ (عن ، عنه یاعەرەبی) دگریت و پسیارەکا کەسێ دویێە .

(ل) یا بەرامبەر (ژ) جهی دیار دکەت . دبیت بێژین (ئەم یێ لمال) بەلی نابیت بێژین ( لمال چوینە بازاری ) ژبەرکو وەسا دیار دبیت هەروەکو ئەم لمال بوین و بیێ ژجهێ خو بلڤین چوینە بازاری . بەلێ ( ژ مال چوینە بازاری ) دروستە .

ئەگەر مە گوت (لێ گەرێ) ئەڤە هەما دجهدا یا لەنگە ، ژبەر کو فەرمان ئان داخواز (گەرە) بیت وەکو (بەردە ، بگرە .. هتد) نەکو (گەرێ) و دیسا (لێ) ژی نەدجهدایە هەروەکو مەگوتی ، دڤێت جێژین (ژێ گەرە) ئەگەر ڤیانا مە ژێ ڤەبون بیت .

* - شەرم :

ئەم دبێژین (ئەڤ کچه یا شەرمینه) و (دزی شەرمە شەرم بو دو نیشادانێت جودا هاته بکار ئینان . یائێکێ چاکییە کو کچەکا زێدە بتورەیە ، یادوی کرێتییە کو مروڤ دەستێ خو درێژکەتە مالێ خەلکی .

دزمانێ مە کورددا جوداکرنەك یاهەی بو دیارکرنا هەردو ساخلەتا هەروەکو دزمانێ عەرەبیدا (حیاء ، خجل = شەرم) و (عار ، عیب = فهێت) . ئەڤجارە بەرامبەری (عیب) یانهو ئەم بێ دئاخڤین (فهێت) یاهەی مخابن مه یاهاڤێتیە پشت خو و ژبیرکری .

ژبەرهندێ پێدڤی یادژوارە بو ڤەگەرِیانەڤێ بو گوتنێد مە یێد دروست و بێژین (ئەڤ کچە یاشەرمینه) بەلێ (دزی فهێته) .

* - قەبر :

ئەگەر ئێکی بدەینە سویندێو بێژینێ (تو بگورێ بابێ خو کەیی هاری من بکە) ئەو مروڤێ تو لگەل دئاخڤی دێ هزرا وی چیتە وێ کورك و ئاخا بابێ وی یێ مری تێدا هاتییە ڤەشارتن و تو ژی وێ سویند و جهی گران لنك وی دزانی ژبەرهندێ وەدبێژیێ . ژبەرهندێ ئاشکەرایە کو بدروستی ناڤێ (قبر ، یاعەرەبی) دکوردیدا (گورە) .

تشتێ عەجێب ئەوە ئەم بشەڤ و بروژ بێژین (دێ چینە سەر قەبرا ، قەبرەکی بو بکولن ، وێهە قەبرێ وییە) و گور ، چو گورِ بابێ خو و هاتە ژبیرکرن .

دزمانێت ئندوئوروپایێدا (گور) یاهەی وەکو ئنگلوسکسونی (GOR) ئانکو سرداب ، کورەکا ئاخ بسەردا هاتییەدادان . هەروەسا دانمارکی (GOOR) ئانکو ئاخ .

* - قولپی و دەعمی :

لناڤ بادینا زمانەکێ وەسا یێ پەیدا بوی کو کەس تێنا گەهیت خودانێد وی نەبن ، مخابن ئەڤ زمانه یێ بەلاڤبوی دناڤ خویندوارا ژیدا .

گەلەك جارا من یێ گوهـ ل سوحبەتەکا هوا ^(بوی) ( دوهی طرمبێلا مه ل طەلعێ دچو ، ل لوڤێ ستێرن فەلتی وەختبو بقولپین . طرمبێلەك موقابل دهات باشبو نەدەعمین .. ) چاك دیارە بوانڤە دهات سوحبەتا خو بکوردی بێژن ( طەلعێ = ئەڤرازی ، لوڤێ = چەپێ ، فەلتی = ڤەرەسیا . وەختبو = چنەمابو . بقولپین = وەرگەرِیین . موقابل = بەرامبەر ، سینگو سینگ . دەعمین = لێکدەن ) .

ئەڤ ئاخفتنا وەکو گێلما گاڤانی ، مخابن گەلەك ژخو رازی

بێ دئاخڤن و ئاگەهـ ژخو نینە کو ئەڤ گوتنێد بیانی ئەگەر هەر بهێنە ڤـەجوین دێ جهێ یێـد کوردی گـرن و بـڤی رەنگی زمان دهێتە تێکشێلان و ژبیرکرن . و زمانەکێ نوی پەیدا دبیت نە کوردەك و نە عەرەبـەك ژ یێت دویری وێ چڤاتا پێ دئاخڤن تێناگەهیت .

ژ لایێ زمانزانیێڤە دبێژنە ئەڤان زمانێت لناڤبەرا تێکهەلبونا موکم یادو زمانـا و زمانـەکێ نوی پێدویـر ژ هەردو بنیاتا پەیدا دبیت ، دبێژنێ (pigeoma komguoge) ئانکو زمانێ کوترا .

**• ـ کچ ـ کوڕ :**

دبێژین ( واهە کچا کێیە ؟ ) ئانکو بابێ وێ کییە ؟ و ( هێشتا کچە ) ئانکو شوی نە کـرییە . بـو هەردو ئارمانجا (کچ) هاتە بکار ئینان ، ئەڤە ژی دروست نینە ، ژبەرکو (کچ) هەر نیشانا شـوی نەکـرنێیە ( عـذراء ـ یاعەرەبی ) بەلێ بو دیارکرنا نێر و مێیا دڤێت بێژین (دوت) وەکو ( ئەو دوتماما وییە ) و (واهە دوتا تەمەرییە ) . بەڤلێ وا ( کوڕ و پس ) هەنە . (کوڕ) ئانکو هێژ ژن نەئینایە (اعزب) بەلێ (پس) ئانکو (ابن) وەکو (پسمام) .

مە گەلەك جارا گوهـ لێ دبیت ئێك دێ بترانەڤە بێژتە بچویکەکی ( صەی پسێ صەی ) .

لڤێرە ژی دیارە (پس) یاهاتییە ژبیرکرن و کوڕ بو هەردو ئارمانجا شوینا خو گرتییە . ئەو ژی دروست نینە .

هەچەرچەندە ( کچ و دوت ) نیشانا مێ ددەن ، و ( کور و پس ) نیشانا نێر ددەن . بەلێ دڤێت دجهێ خودا بهێنە گوتن و دیارکرن .

**• ـ گران :**

دهێتە گوتن ( دنیا گرانییە ) و ( بارەکی گرانە ) و ( گـرانییا بـاری چـەنـدە . دڤێت دهشیـاربـین لدەمێ نیشادانا ( گرانیێ ) و ( سەنگێ ) .

دروستە بێژین ( بارەکێ گرانە ) بەلێ وەنینە بهێتە گوتن ( گرانییـا باری چـەندە ؟ ) دڤیـا ( سەنگـاباری چەندە ) با . بەلێ بنەجهە بێژین ( ئەڤ بارە چەنـد یێ گرانە ) ژبەرکو ( گرانی = ثقل ) و ( سەنگ = وزن ) .

( من سەنگاند ) ئانکو من کێشا ، بەلێ ( من گرانکـر ) ئانکو من پتر هاڤێتە سەر .

**• ـ لەز**

لدەمێ ئـاخڤتنێ (سـرعـە) یـاعـەرەبی دهێتـە بکارئینان بو لڤینێ . دێ بێژین ( طرمبێل گەلەك سەریع دچو ) . ئەڤە باش نینە ژبەرکو بو چ دێ ( لەز = سرعە ) بپشت گوهێ خوڤە هاڤێین ؟ .

مە یێد هەین ( گران ـ ثقل (للحرکە) ) و (هێدی ، لسەرخو = علی مهل ) و ( سڤـك = حرکـە خفیفة ، سرعە عادیە ) و ( لەز = سرعە ) هەرچەندە (لەز) بخو لڤینا سڤکە (سرعە) یە بەلی لدەمێ بکارئینانی لڤینا دژوار دیـاردکەت هـەروەکـو بیـژین ( زور بلەز ) . ئـەگـەر پسیارکەین چونا سڤك یا ئوتومـوبێلی (سـرعە السیـارة) چەندە ؟ چاکە بێژین ( لەزا وێ چەنـدە ) هەروەسـا بو هەمو لڤوکێد (متحرك) دی .

**• ـ کەل ـ گەرم**

أ ـ دبێژین ( دنیا یا گەرمە ) و ( ئاڤ یا کەلە ) . دڤێت دهشیار بین لجوداکرنا هەردو دیارکرنا لگەل تینێد دی . ( تین = حرارە ) یە ، و ( تینخوش = دافئ ) و ( گەرم = حار ) و پاشي ( کەل = مغلي ) . ئەڤ هەرسێیە دڤێت دجهدا بینە دیارکرن .

ب ـ دیسا بو (تینێ) مە هەنە ( هوین = معتدل ) و (طەزی = بارد ) و ( سار = بارد جدا ) . ئەڤجارە دێ بێژین ( دنیا یا هونیە ، دنیا یا دطەزیت ، دنیا یا سارە ) . دروست نینە ( طەزی ) و (سار) بو ئێك ئارمانجبن .

ج ـ بو تەڕاتی وهشکیي ( شهـ = رطوبە ) پاشي ( تەڕ = مبلل ، طری ) ددویڤدا ( کزر = رطب قلیلا ) دوماهیێ ( هشك = یابس ) .

( زوها = ناشف ) بو دیارکرنا ( درجات الحرارة و الرطوبة ) دڤێت بێژین ( پاییت تینێ و شهێ ) .

**• ـ مێر ـ زەلام**

یازانا ئەوە کو (مێر) گەهشتییە وەکو ( حەسو مێرێ بەسێ هات ) ئانکو حەسو یێ بژنە و ناڤێ ژنا وی بەسێیە .

بەلێ ( زەلام ) دیسا نێرەکێ گەهشتییە ، دبیت یێ بژن بیت و دبیت نەء وەکو ( حەسو زەلامێ بەسێیە ) ئانکو یێ لبەر خلمەتا وێ نەکو مێرێ وێیە .

ئاشکەرایە کو ( مێر = زوج ) زەلامەکێ بژنە ، و ( زەلام = رجل ) نێرەکێ گەهشتیە هەروەکو مەگوتی . ژبەر هندێ دڤێت دهشیاربین لدەمێ دیارکرنا ڤان هەردوا .

نابیت بێژین ( بەسێ صەد مێر یێد هەین ) بەلێ ( صەد زەلام یێد هەین ) . هەروەسا نابیت بێژین ( حەسوی مێرەکێ هەی ) بەلێ ( زەلامەك یێ هەی ) .. هتد .

*** - هات - هاتن**

لدەمێ ئاخفتنێ و نڤیسینێ دبێژین ( دێ ئێت ، یێ تێت ، یێد تێن ، تێتە گوتن .. هتد ) ئەڤە هەمو دلەنگن ژبەرکو بنیات (هاتن) ە ژبەر هندێ یا دروست ئەوە کو بهێتە گوتن ( دێ هێت ، یێ دهێت ، یێدهێن ، دهێتە گوتن .. هتد ) .

من باوەرە خازتنا من یا گرانە ژبەرکو ئەم هەمو یێد فێری بکارئینانا خەلەتبوین بەلێ پێدڤییە لخوبدەین لەنگێیت زمانێ خو هێدی هێدی دروستکەین .

*** - هاریکاری**

بو دەستگرتن و ئانەهدانا ئێکودو دبێژین ( هاریکاریا وی کر ) . دبنیاتدا (هاری) نینە بەلێ (ئال) ە ئەوژی کنارە ( جهە - طرف ) . ئەوبنحو ( ئالکاری ) یە . بەلێ (لام) هاتە شکاندن بئاخفتنێ و بو ( ئالیکاری ) .

دکرمانجیدا (لا) شوینا (ئال) گرتییە وەکو (لایێ دی) شوینا ( ئالێ دی ) . یرایێد مە یێد بوتان دروست دبێژن . ئەم ژی دبینین مە (ئال) و (لا) یێد تێکشێلاین لدەمێ بکارئینانێ وەکو ( هەڤال ) یا ژ ( هەڤال ) یا ژ ( هەڤ + ئال ) هاتی ، ئەم وێ دروست دبێژین بەلێ ( بێ لا ) دروست نینە .

*** - هار**

دهێتە گوتن ( گەلەکێ - گەلەکا هارە ) ئانکو شەڕوکەیەکێ دژوارە . ئەڤە نەدجهدایە بو چ ؟ . (هاری) نەخوشییا سەگایە ، سەێ هار ئەگەر لەقەك دانا مروڤەکی دڤێت بهێتە دەرمانکرن ئان ئەو ژی دێ هاربیت . دیارە کو ( هار = مکلوب ) نەخوشییە سەگا دگریت ، بەلێ هەتبعەتێ ڕەق و دوژار دبێژینێ (دڕ) و (دڕندە) بعەرەبی ( شرس وحش ) . برایێد مە یێد سوران دروست دئاختن ، دبێژنە مروڤ ئان سەگێ دژوار و شەڕوکە (دڕ) وەکو ( ئەم سەگە - یان - پیاوە دڕە ) هەروەسا ئاکرەیی ژی (دڕ) دروست بکاردهینن .

*** - هەیڤ - مەهـ**

( هەیڤ یا چاردەشەڤییە ) و (سالێ دوازدە مەها حالێ مە ئەڤەیە ) .

ئاشکەرایە کو (هەیڤ) ستێرا ڕونە بەلێ (مەهـ) پارچەکە ژ دوازدا یا سال ژوان پێکدهێت ئانکو هژمارەکا ڕوژایە . دروستنینە (هەیڤ) بو ستێرێ و دەمی بهێتە گوتن بەلێ هەرئێك ژ وان (هەیڤ) و (مەهـ) دجهێ خودا بهێتە دیارکرن وەکو (هەیڤا مە یا سێ ڕوژییە) (ڕوییێ وێ وەکو هەیڤێیە ) و ( سال دوازدە مەهە ) ( مەها بوری باران بارین ) .. هتد .

*** - هوی - فێر**

گەلەك نڤیسین من یێد دیتین تێدا یا هاتی ( چەوا دێ هوی بییە زمانی ؟ ) ، ئەڤە نە دجهدایە هندی کو ئارمانج نیشادانا زانینێیە . بعەرەبی (تتعلم) .

هویبون دزمانێ کوردیدا ژێ نەرەڤینێ دیاردکەت هەروەسا پێڤەنویسیانەکا خوشدقی وەکو ( کورێ من هوێی خو یێ دایە مەتا خو ) بعەرەبی (الف - الفه) هەروەکو (کەهی) . ژبەرهندێ دڤێت ( فێر ، فێربون .. هتد ) بو کاری نیشادانێ و تێگەهشتنێ بهێتە گوتن ( چەوا دێ فێرببیە زمانی - فێری زمانی بی ) .

*** - پیر**

دبێژین ( پیرە مێرە[وان] پیرەژنە ) بو نیشادانا هندێ کو مروڤەك یێ دژیەکێ درێژدا . (پیر) دبنیاتدا دهێتە گوتن بو مروڤەکێ خودان جهـ و پایەبلند بەلێ بو ژی درێژیێ دڤێت بێژین (کال) .

نووسینی H.G. Wells

مەجید ئاسنگەر لەئینگلیزیەوەوەری گێڕاوە

[یەکێ لە خەیاڵە زانستیيە هەمیشە زیندووەکانی ئێچ . جی . وێڵز) - ئاخۆ چی ڕوو بدات) ئەگەر ئەستێرەیەکی بەرەڵلابوو بێتە نێو کۆمەڵەی خۆری ئێمەوە ؟] .

# ئەستێرەکە ..

کەم کەس ، لەوانەی ڕاهێنانێکی ئەوتۆیان لە زانستدا نی یە ، دەتوانن دەرك بە گۆشەگیرییە بێ ئەندازەکەی (کۆمەڵەی خۆر) بکەن . ڕۆژ بە ئەستێرە گەڕۆکە بچووکەکانیەوە ، بەو گەردیلانەوە کە بە دەوریدا دەسووڕێنەوە ، بەو نەیزەك و شەهابە هێچگار ووردیلانەیەوە : لە بۆشاییەکی ئەمەندە فراوانی بێ‌ئەندازەدا مەلە دەکات کە خەیاڵ هەرگیز پەی پێ نابات . لەپشت مەداری (نیپتۆن)دا بۆشاییە : نەگەرمی و ڕووناکی تیادایەو نە دەنگیش . بۆ ماوەی بیست ملیۆن جار ملیۆن میل بۆشاییەکی بەتاڵە ئەوەیش کەمترین ماوەیە کە دابنرێت بەر لەگەیشتن بە هەرە نزیکترین ئەستێرەیەك و سا بێجگە لە ژمارەیەکی کەم لە نەیزەك و شەهاب کە قەوارەیان نەختێ لە بار یکترین گڕەوە ئەستوورترە هیچ ماددەیەك هەرگیز بەم کەنداوی بۆشاییەدا تێنەپەڕیوە . هەتاکو لەسەدەی بیستەمدا گەڕۆکێکی نەناسراوی عەنتیکە بەدەرکەوت کە بریتی بوو لە تەنێکی هیجگار زەبەللاح و بەبێ خەبەردان زۆر بە تیژی لە نهێنی ڕەشایی ئاسمانەوە بەرەو ڕووناکی خۆرتەکانی دەدا . ڕۆژی دووەم بەهەر ئامێرێکی چاك بەڕوونی دەبینراو لە ماوەیەکی کەمدا وای لێهات بە دووربینێکی ئاساییەوە ببینرێت . لە ڕۆژی سێهەمدا خوێنەرانی ڕۆژنامە بۆ یەکەمجار لە گرینگی ئەم دیاردەیەوە ئاگادار کرانەوە . ڕۆژنامەیەکی لەندەنی بیروڕای «دۆچین Duchaine»ی زانای بڵاوکردەوە کە ئەم ئەستێرە بیانی‌یە نوێیە دەشێ لەگەل نیپتون)دا خۆیان لەیەك بدەن ، بەم چەشنە لە زۆربەی پێتەختەکانی دونیادا خەڵك چاوەڕوانی ڕوودانی دیاردەیەك بوون لە [illegible]

ئەو شەوە هەزاران کەس چاویان بە ئاسمانەوە ڕووابوو ، بەلام ئەستێرە ئاشناو گۆڕینەکانیان بینین : وەك هەمیشەو بێ هیچ گۆڕانێك ... بەلام ، لە بەرەبەیاندا ، ئەو تاقمانەی زوو چووبوونە بازاڕەکانەوە (شتە) کەیان بینی : ئەستێرەیەکی گەورەی سپی‌باو لە ناکاودا بە ئاسمانی خۆرا واوە پەیدا بوو ! سەعاتێکیش بوو ڕۆژبوو بۆوە ئەم هێشتا هەر دەدرەوشایەوە : سپی و گەورە ، وەك خەپڵەیەکی چووکەڵەی بازنەیی دیارو بریسقەدار . لە سەدان ڕوانگەی ئەستێرە شوناسی‌یەوە پەشێوی و واق و وڕمان پەنگیان خواردبۆوە ، لە کاتێکدا تەنە دوورە دەستەکە بە هەڵەداوان ڕووەو (نیپتون) هەڵەتی دەبرد پەلە پەل‌بوو بۆ کۆکردنەوەی ئامرازی فۆتوگرافی و سپێکترۆسکۆبەکان بۆ تومارکردنی ئەم دیمەنە سەر سوڕهێنەرەوە : وێرانبوونی جیهانێك ! چونکە بەڕاستی جیهانێك‌بوو ، خوشك ئەستێرەیەکی خۆمان - بێگومان ، کە ئە ئاوا لە ناکاودا ڕووبەڕووی مەرگە ساتێکی گڕاوی بوو بووە . (نیپتون) ڕاستەوخۆو پانەوپان لەلایەن ئەستێرە نەناسراوەکەی ئەو دیوی بۆشاییەوە لێدراو گەرمی لێکدانەکە دوو ئەستێرە ڕەقەکانی گۆڕین بۆ گلپەیەکی گەرمی هێجگار ناقۆلاوە . ئەو ڕۆژە ، دوو کاتژمێر پێش بەیان ئەستێرە زلە سپی‌باوەکە بە دەوری جیهان‌دا ڕۆیشت و تەنیا ئەو کاتە ونبوو کە لە ڕۆژاوادا نقومبوو بووو خۆر لە ئاسمان‌دا بەرز بۆوە .

دووەمجار کە هاتەوە سەر ئەوروپاوە ، لەگشت شوێنێکدا کۆمەلانی تەماشاکەران بەسەر هەڵدێری گردو تەپۆلکانەوە ، بەسەر بانانەوە ، لە دەشت و دەراندا ، بێداربوون : چاویان بڕیبووە خۆرهەلاتو چاوەڕوانی هەڵهاتنی ئەستێرە زلە تازەکە بوون . کە هەڵهات - شەوقێکی سپی لە پێشەوەیەوە هەر وەك گڕێکی ئاگری سپی ، سەرتاپا دونیای ڕۆشن کردەوە . ئەوانەی شەوی پێش نز بونەکەیان دی بوو کە چاویان پێ کەوتەوە هاواریان لێ هەڵساو قیژاندیان : «ئێستی گەورەترەو بە شەوق تریشە !» کەچی لە نۆڕینگە تاریکەکاندا زانا ئێشگ چی‌یەکان هەناسەیان لەخۆ بڕیبووو بە حەپەساوییەوە خێسەیان لێك دەکردو دەیان گوت : «نزیکتر بۆتەوە نزیکتر !» چرکە چرکی تەلبیگراف ئەم ووشەیەی قۆستەوەو بە نێو

تەلەکانی تەلەفۆندا لەرزیبەوەو لە هەزار شاردا نووسەران پەنجەیان گەیاندە چاپەوە . «نزیکترە» . پیاوان کە لە هەزار شوێندا گفتوگۆیان دەکرد لەناکاو بڕیارێکی ئەندیشەیاندا بەسەر ووشکانەوە . ئەو ڕۆژەیش وەك براکەی بەرایی چووە سەرو لەگەل دوا پاسەوانانی تاریکایی تەماویدا ئەستێرە بیانییەکە هەمدیسان بەرز بۆوە . ئەمجارەیان هێند گەشبوو کە مانگی چواردە لە ئاستیدا دەتگوت تەنیا شەبەحێکی کالی خۆیەتیو هیچیتر .

هەموو سووچێکی جیهان ئەو شەوگارە بێداربوو زەنگ لە ملیۆنەها قوسەی کلیساکاندا بەگوێی خەلکیان دەدا کە چیتر تاوان نەکەن بەلکو لە کلێساکانا بۆ نوێژ کۆببنەوەو بپاڕێنەوە . شەقامو خانوو هەمووی ڕووناك ، بوون ، ئاوکۆکانی کەشتییەکان دەدرەوشانەوە ، وە هەرچ ڕێگاو بانێ کە بەرەو بەرزاییەکان هەلکشابوون بە درێژای شەوگارەکە مۆنجەیان دەهات لە خەلکدا لەسەر جەمی دەریاکانیشدا پاپۆرە پڕاو پڕ لە خەلکەکان ڕووەو ئۆقیانووسو بەرەو باکور ئامادەی هەلاتن بوون . ئەمەیش چونکە پێشەکی ئاگادارییەکی پسپۆڕێکی ماتماتیك ـ زان لە سەرتاپای جیهاندا بە برووسکە ڕاگەیاندرابوو . ئەستێرە تازەکەو (نیپتۆن) بە دەست لەملانێیەکی ئاگرینەوە زۆر بە تەوژم ڕاستەوخۆ ڕووەو خۆر تەکانیان‌دەدا .

لەهەر چرکەیەکدا ئەم تۆپەلە گڵپە دارە سەد میلی دەبڕیو لەهەر چرکەیەکیشا تەوژمە تۆقینەرەکەی زیاتر دەبوو . ئێستی کە وا بە ئاسمانەوە دەفڕی دەبوو سەد ملیۆن میل لەزەمین دوور بکەوتایەتەوە . بەلام لە نزیك ڕێڕەوە دیارکراوەکەیەوە ئەستێرە بەهێزەکەی (جووپیتەر) . موشتەری ـ و مانگەکانی زۆر خێرا دەسووڕانەوە سەربەرزانەو لەسەرەخۆ بە دەوری ڕۆژدا دەخولانەوە .

هەر چاوتروکانێك هێندێ ڕاکێشانی نێوان ئەستێرە ئاگراوییەکەو هێزەهەرە مەزنەکەی ئەستێرەکانی‌تر زیاتر پەرەی دەسەند . باشە ، ئەدی ئەنجامی ئەو ڕاکێش ڕاکێشە ؟ چارنییە (جووپیتەر) لە خولگەی خۆیدا دەترازێنرێت‌و دەخرێتە سەر ڕێڕەوێکی هێلکەییەوە . ئەستێرە ئاگراوییەکەیش ، کە لە ئەنجامی ئەو ڕاکیشانەوە ڕێڕەوی تەکانە بەرەو خۆرەکەی لێ دەگۆڕدرێت ، ڕێڕەوێکی لار بۆ خۆی دەگرێتە بەرو لە وانەیشە لەگەل زەمینی ئێمەدا خۆیان لەیەك بدەن‌و بێگومان زۆر لەنزیکییەوە تێپەڕێت .

«بوومەلەرزە سەر هەلدانو تەقینەوەی بورکانەکان ، گێژەلووکەو گەرداو ، لافاو تۆفان ، وەبەرزبوونەوەیەکی بەردەوامی پلەی گەرمیی بۆ نازانم چ سنوورێك» ـ ئە ئاوا پرۆفیسۆرە ماتماتیك زاناکە پێشبینی کردبوو .

بەلام ناشێ تۆ وای دابنێیت کە سەراپای دونیا بەهۆی ئەستێرەکەوە ترسە تۆقێنەرەکەیان لێ‌نیشتبوو . نەخێر ، لە دەبەشان نۆ بەشیان هەر بەکارو فەرمانی ئاسایی خۆیانەوە خەریك بوون . ڕۆژنامەکان سووربوون لەسەر دەرزەکەی سالی یەك‌هەزار ـ چونکە ئەو سایش خەلکەکە پێشبینی کۆتاییە کەیان کردبوو . ئەستێرەکە تەنیا غاز بوو ـ ئەستێرەیەکی کلکدار ، وە لەوانەیش بوو نەتوانێ خۆی لە زەوی بدات . لەوەوپیش هەرگیز شتێکی ئە ئاوا ڕووی نەدابوو . هەستی دروست لە هەموو شوێنێکدا پتەوو چەسپاو گالتەی بەوانەیشەوە دەهات کە تۆقیبوون‌و بگرە نەختێکیش حەزی دەکرد ئازاریان بدات .

ئەو شەوە لە حەوت‌و چارەکێکدا بەکاتی (گرنیشی) ئەستێرەکە دەگاتە نزیکترین شوێن لە «جووپیتەرەوە» . ئەوسا جیهان چاوی بە چارەنووسی شتەکان دەکەوێ‌و دەبینێ چ شێوەیەك وەردەگرن ، بەلام لێرە بەدواوە قاقای پێکەنین و یستا : ئەستێرەکە گەورەبوو ـ سەعات بەسەعات‌و بە بەردەوامییەکی ترسناکەوە تا دەهات زلترو گەشتر دەبوو تا وای‌لێهات شەوەکەی گۆڕی بەڕۆژی ڕووناك . شەوی پاشتر بەسەر (ئەمەریکا)دا . هەلات بەقەبارەیەکی نزیك لەهی مانگەوە ، بەلام هێجگار گەرم ، بەجۆرێ هەرچی سەیری بکردایە ڕەشایی لە چاویدا نەدەهێشت . هەناسە بایەکی زۆر گەرم هەلیکردو تا دەهات تەوژمی دەسەند . بەسەر (ڤەرجینیا)و (بەرازیل لە خوارووی دۆلی (سانت لورانس)دا ئەستێرەکە بەنێو ڕەوە هەوری دووکەلاویو بەگرمە گرمی هەورە تریشقەو برووسکەداری تیژ ڕەودا سەرەتاتکێی دەکردو برووسکەی ڕەنگ بنەوشەیی ناوە ناوە دونیای دادەگیرساندو دەکوژایەوەو ئینجا دایکردە تەرزەیەکەوە هەرگیزاو هەرگیز وێنەی نەبینرابوو . لە (مانیتوبا)دا بەفر توایەوەو لافاوی وێرانکار گشت لایەکی گرتەوە . لەسەر هەموو

شاخەکانی بان زەویدا بەفرو سەهۆڵبەندان کەوتنە توانەوە . سەرجەم رووبارەکانی شوێنە بەرزەکان کوڵاو کوڵ پڕو بەلرفە رف هەڵسابوون و درەختو لاشەهای گیانلەبەرو ئادەمیزادیان وول و راپێچەك دەدا زێیەکان تا دەهات لەنێو پڕشنگە ترسناکەکەوە زیاتر هەڵدەستان و بە نەرمی بەسەر نیوارەکانیاندا دەپڕژان بە شوێن دانیشتووانی دۆڵەکانیانەوە کە ئێستێ هەڵدەهاتن . بە درێژی کەناری (ئەرجەنتین)و سەرووی (ئەتلەنتیکی باشوور) یشەوە خێراوەکان هێندە بەرز بووبوونەوە کە ئەوەندەی بە بیری ئادەمیزاد بێت شتی ئە ئاوا هەرگیز رووی نەداوە . گەرداوەکانیشی دەیان میل ئاوەکانیان بۆ سەر ووشکانی رادەپێچین و چەندان شاریان بە تەواوی لەئاو نقووم دەکرد . ئەوەندە گەرمایی شەوەکە تێنی سەندبوو هەڵهاتنی خۆر لە ئاستیدا وەکو هاتنی سێبەرێ وابوو بوومە لەرزە دەستی پێکرد .

لە خوارووی (ئەمەریکا)دا ـ لە بازنەی تەوەری باشوورەوە تا دەگاتە (کێپ هۆرن) گردو تەپۆلکە هەرەسیان دەهێنا ، زەوی دەقڵەشییەوە ، خانووبەرەو دارو دیوارسەراپا رۆدەهاتن و کاول دەبوون .

بەم شێوەیە ئەستێرەکە ، بەخۆو بە مانگی رەنگ کاڵی نێو پێخەفی بیماریدا ، بەسەر (پاسیفیك)دا گوزەری کردو گەرداوی برووسکاوی بەدوای خۆیدا هەڵدەکردو شەپۆلە هەمیشە پەرەسەندووەکانی خێراوەکان کە بە شوێنیدا لووشەلووشیانبوو کەفوکوڵیان دەکردو دوورگە بەدوای دوورگەیان دەکرد بەژێرەوەو لە مەردوم پاکیان دەکردنەوە لە ئەنجامدا بە شەوقێکی چاو کوێرکەرانەوەو بە هەناسەیەکی تەنووریی‌یەوە دیوارێك ئاوی پەنجا پێ بەرز وەك برسی‌و هەڵپەلپ بەسەر دەشتاییەکانی (چین)دا بەرەو ناوەوە هەڵەتی برد .

بۆ ماوەیەك ئەستێرەکە ـ ئێستێ گەرمترو زلترو رووناکتر لە خۆر لە ساتی هەرە بەهێزیدا ، بە شەوقێکی بێ بەزەیی‌یانەوە وولاتە پانو بەرینە پڕ لە خەڵکەکەی رۆشن کردەوە : شارو گوندەکان بە پەرستگاو دارو درەختەکانیانەوە ، بە رێگەو بانەکان و کێڵگە فراوانە داچێنراوەکان و هەروەها ملیۆنەها خەڵکی بێخەو کە لە ترسێکی ئومێد بڕدا چاویان بە ئاسمانە هێجگار بەشەوقەکەوە ڕووابوو : ئەوسایش نزم و لە زیاد بووندا ، هاژەی سێلاوان دەهات . باری ملیۆنەها پیاو ئەوێ شەوێ بەم جۆرە بوو ـ هەلاتنێك‌بوو دەست و قاچەکان لە گەرمانا قورس و سست ، هەناسە : سووار و تەنگ لافاویش وەك دیواری خێراو سپی بە دوویانەوە . لەپاشانیشدا : مەرگ .

وولاتی (چین) بە مەشخەڵێکی سپی و گلپەدار داگیرسابوو . کەچی بەسەر (ژاپۆن)و (جاوە)و سەرجەمی دوورگەکانی رۆژهەلاتی (ئەفەریقا)وە ئەستێرە مەزنەکە تۆپەلە ئاگرێکی سوورو کاڵ بوو لەبەر ئەو هەڵمو دووکەڵ و مشکی‌یەوە ك بورکانەکان هەڵیان دەدانە دەرەوە بۆ پیشوازی کردنی هاتنەکەیەوە سەراپای زەمین کەوتە هەژانەوەو شریق و هۆڕەوە هەر زوو بەفرە دێرینەکەی (تیبت و هیمالایا) کەوتە توانەوەو بە لێشاو بەنێو ملیۆنەها کەنداواندا کە تا دەهات قووڵتر دەبوونەوە ، بەسەر دەشتاییەکانی (بورما)و (هیندوستان)دا دەرژانە خوارەوە سەرە تێکڤژاوەکانی جەنگەڵ و دارستانە چڕەکانی (هیند) لە هەزار شوێندا گڕیان گرتبوو ، وەلەژێر ئاوە تیژڕەوەکاندا بە دەوری قەدی درەختەکانەوە زۆرەها شتی رەش هەبوون کە تا ئێستا بە سستی کۆششیان دەکردو گڕە وەك خوێن سوور هەڵگەڕاوەکانی ئاگریان دەبریسکاندەوە وەکۆمەلانی ئافرەت و پیاوی شپرزە بە رێچکەی رووبارەکاندا سەرەو خوار هەڵدەهاتن ـ بۆ تەنیا دوا هیواکەی ئادەمیزاد دەریای پانو بەرین !

ئەستێرەکە تا دەهات زلتر دەبوو ، گەرمترو بلێسەدارتر ، خێراییەکەیشی ئێستێ توقێنەر بوو .

گەردەلوولی هەڵم لەو شەپۆلە رەشانەوە هەڵدەستا کە بێ پسانەوەو زۆر بەگوڕ شالاویان دەهێنا و لەگەڵ ئەو پاپۆڕانەدا کە گەرداو یاری پێدەکردن دەبوون بە خاڵ بەسەر رووی دەریاوە . تێکرای دەشتاییەکانی (هیند) ئەو شەوە بوونە بیابانێکی تەنکاوی بریسقەدار ، پەرستگاو کۆشك و تەلارەکان و گردو تەپۆلکەکان کە لە خەڵکدا رەش داگەڕابوون تیایدا بەرز دەچوونەوە . هەموو منارەیەك ، وەك هێشوو ، تۆپەڵ خەڵکیان تێوە ئالابوون ، ئەو خەڵکەی چونکە گەرماو ترس چۆکیان پێدادابوون یەك بە دوای یەکدا بۆ ناو ئاوە لێڵەکە خل دەبوونەوە .

لەو کاتەدا (موعجیزەیەك) روویدا . لەناکاو ، کاتێ ئەستێرەکە بەسەر (هیند)ەوە هەڵواسرابوو ، سێبەرێ باڵی

بەسەر ئەو کوورەی بێ ئومێدی‌یەدا هەڵکیشا ، ئینجا هەناسەی کزەبایەکی فێنك هاتو ئەوجا لە هەوا ساردەوە بووەکەوە ڕەوە هەور گردبوونەوە پیاوان بە نیمچە کوێری‌یەکەوە چاویان بڕیبووە ئەستێرەکەوەو ڕوانی‌یان وا پەڵەیەکی ڕەش بەسەر ڕووناکی‌یەکەدا دەکشا . تومەز ئەوە مانگ‌بوو هاتبووە ناوەند ئەستێرەکەو زەمینەوە . وەتەنانەت کە پیاوان لەم ساتەی حەسانەوەدا لەبەر خوادا دەپاڕانەوە ، لەخۆر هەلاتدا ، بە تەووژمێکی سەمەرەوەهۆنەزانراوەوە ڕۆژ دەرپەڕی . ئینجا ئەستێرەکەو ڕۆژو مانگ سێ‌قۆڵی بە یەکەوە بە ئاسماندا تیژ تێپەڕین . جا ئێستێ بۆ چاودێرە ئەوروپی‌یەکان بار ئە ئاوا بوو : ئەستێرەو خۆر لەیەك نزیك‌و بەسەر یەکەوە هەڵهاتن‌و سەرەو ڕۆیانە بەرەو بۆشایی‌یەك تێ‌یان تەقاند :

ئینجا نەختێ هێواش‌ترو لە دوایی‌دا پشوویەکیان‌دا ئەستێرەو خۆر یەکیان گرتو بوون بەیەك مەشخەڵی گڕ لە چەقی ئاسماندا . چیتر مانگ بەری ئەستێرەکەی نەگرت‌و بگرە خوشی لەنێو ڕووناکی‌یەوە بە شەوقەکەی ئاسماندا هەر لەچاوپشا ونبوو . جا هەرچەند ئەوانەی تا ئەوکاتە لە ژیاندا مابوون زۆربەی کات خۆیانیان لێ‌گێل کردبوو گەوجانەو بێ‌باك تێوەیان دەڕوانی ، بەلام هێشتاش پیاوی وا هەبوون لە مانای ئەم نیشانانەوە تێ‌بگەن : ئەستێرەکەو زەمین گەیشتبوونە ئەوپەڕی نزیکی‌یانەوە ، یەك بەدەوری یەکدا سووڕابوونەوەو ئەستێرەکە ڕەت‌بووبوو . ئێستاکێ لەدوا قۆناخی گەشتە بێ‌جلەوەکەیدا خێراترو بەگوڕتر ، کەوتبووە پاشەکشە ... سەرەو خوار بۆ نێو ڕۆژەوە !

لەپاش ئەوەدا هەوران گردبوونەوە . هەورە تریشقەو برووسکە چارشێوێکیان بەدەوری گێتی‌دا تەنی . لە سەرتاپای زەوی‌دا ڕەهێڵەو شەست بارانێکی ئەوتۆ دایکرد مرۆڤ لەوەپێش هەرگیز نەیدیبوو . لەو شوێنانەدا کە بورکانەکان ڕوو بەڕووی خیوەتی هەورەوە لەپڕ سوور هەڵ‌دەگیرسان لێشاوی قوڕو لیتە چۆڕاوگەیان تیادا دەبەست . لەگشت لایەکەوە ئاوەکان هەڵساو بوون‌و خوڕ بەسەر ووشکانی‌یەکاندا ڕادەبووردن‌و شوێنەواری وێرانەی لیتەو قوڕاوی‌یان جێ‌دەهێلا ، زەویش وەکو لێوارێکی نوقمی گەرداو پڕی بووبوو لەو هەموو شتانەوە کەسەر ئاو کەوتبوون لەتەك لاشەی بێ‌گیانی ئادەمیزادو جانەوەرانەوە ئەو ڕۆژانەیش کە بەدوای ئەستێرەکەو گەرمایی‌یەکەدا هاتن ڕۆژگاری تاریکی بوون بۆ ماوەی چەندان حەفتەو هەیڤەوە بوومەلەرزە هەر بەردەوام بوون .

بەلام ئەستێرەکە گوزەری کردبوو . مرۆڤیش کە برسیەتی ووزەی لەبەدا بڕیبوو زۆر لەسەرخۆ زاتی وەبەر دەهاتەوە ، ووردە ووردە خشینەوە ، بەرەو شارە کاول بووەکانیان‌و ئامباری دانەوێڵەی بن‌قوڕو لیتە کەوتووەکان‌و باخو کێڵگە لە ئاودا خنکاوەکانیانەوە ئەو ژمارە کەمە کەشتی‌یانەیش کە لە چنگ گەرداوەکاندا ڕزگاری‌یان بوو بوو بە تێکشاوی وەك گێژ زۆر گران‌و بەترسەوە بە تاقی‌کردنەوەو پێوانی قووڵی دەریاوە ، بەنێو تەنکاوە تازەکاندا هاتنەوە کە سەردەمێك بەندەری ئاشناو ناسراوبوون ئەوجا کە گەرداوەکان ڕەوینەوە مرۆڤ بۆی دەرکەوت کە لە هەموو شوێنێکدا ڕۆژگار درێژتر بوون لە جاران‌و خۆر زلترو مانگ کە تەنیا بەقەد سێ‌یەکی قەوارەی پێشووی لێ‌هاتبووە ئێستێ لە نێوان نوێ بوونەوەیەك‌و نوێ بوونەوەیەکی تریدا هەشتا ڕۆژی ڕەبەقی دەخایاند . ئەستێرە ناسانی تایبەت (مەریخەوە) ئەم ڕووداوانە بە قووڵی‌و لە ناخرا سەرنجیانی ڕاکێشابوون .

«ئەگەر سەرنج بدەینە بارستایی‌و پلەی گەرمی ئەو مووشەکەوە کە بەنێو (کۆمەڵەی خۆری) ئێمەدا بۆناو ڕۆژ تەقێنرابوو» یەکێکیان نووسی ، «شتێکی سەر سوڕهێنەرە زەوی کە زۆر بەزەحمەت لە پێکانی مووشەکەوە ڕزگاری بوو بوو ، ئەم زیانە کەمەی لێکەوتووە ؟

گشت نیشانە جیاکەرەوە ناسراوەکانی کێشوەرەکان‌و بارستایی دەریاکان وەکو خۆیان ماونەتەوە .

وە لە ڕاستی‌دا تەنیا جیاوازی‌یەك وا پێدەچی کەم‌بوون‌و پووکانەوەی ڕەنگ سپی هەڵگەڕان بێت (کەوا دانراوە ئاوی بەستەڵەك بێ) لە دەوری هەردو تەورەکاندا» ئەمەیش تەنیا ئەوە دەگەیەنێ کە گەورەترین کارەساتێکی ئادەمیزاد بۆی هەیە چەند چووکەلە بێتە بەرچاو لە دووری چەن ملیۆن مێلێکەوە) !

● سەرچاوە: The Readers Digest
Volume 73 October 1958
P.P. 173 — 180



● مولود بێخاڵی ●

# کۆسە بەبە

لەدێر زەمانەوە گەلێ ساڵی وا بەسەر وڵاتدا دەهاتن ووشکیەتیو کەم بارانی نیشانەی قاتو نەهاتیو گرانیان پێوە دیار دەبوو ، کە لە ئەنجامیدا هەژارو جوتیارو بێچارەو چەوساوەکانی زۆربەی ناوچەکانی کوردوستان دووچاری گەلێ دەردی سەریو باری ئابووری سەختو پڕ مەینەتو ناهەموار دەبوون تەنانەت گەلێ جاری واش دەبوو ژیانیان دەکەوتە مەترسیەوەو لەلایەن دەسەلات دارو دەوڵەمەندەکان دەچەوسێنراوەو ئەو کارەساتانەی ژیانو بێ دەرامەتی‌یە وای لەو خەڵکە دڵپاکو سادەو هەژارانە دەکرد کە پەنا بەرنە بەر هەندێ خوو نەریت ، بۆ ئەوەی لەڕێگەی پەیڕەو کردنیانەوە هەندێ لەو ئاواتانەی لە دڵیاندا پەنگی خواردبۆوە بێتە دی ، ئیتر لەو بوارەوە هەر شارە تایبەتیەتێکی خۆی هەبووەو پەیڕەوی کردووە ، بۆ نموونە لە شاری هەولێرو هەموو لادێو ناوچەکانیدا هەرکە هەست بەکەم بارانیو ووشکیەتی بکرایە ئەوە «کۆسە بەبە» دەبووە وێردی سەر زاری تێکرای هەژارو جوتیارو چەوساوەی ئەو ناوچانە بەگەورەو بچووکیانەوە ..

لەناوچەی سلێمانیش «بووکە بە بارانێ» هەمان مەبەستی دەپێکا ، ئەو نەریتە کۆنەی نێو کۆمەلێ کوردە واریمژدەی ئاواتێکی مەزنی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرتو هیوایەکی گەورەو زیندووی دەخستە دڵو دەروونی ووردو درشتی سەرجەم جوتیارانی ناوچەکانی کوردوستان .

یەکێ لە ئاواتە هەرە مەزنەکانی ئەو نەریتە کۆنەی کوردەواری ئەوەبوو باران ببارێت تاوەکو بەرهەمی دەغلو دانو دانەوێڵە زۆربێتو خێروخێرات بکەوێتە ناو وولات لە بریتی گرانیو ناکۆکی ژیان ، چونکە ساڵیك گەر باران نەباریایە مەترسی گرانیو قاتو قریو مەڕو ماڵاتو کەمیو نەبوونی زۆر جۆرە مێوەو سەوزە سەری هەڵدەدا ، ئەمانە لەتەك دەربەدەر بوونی دەیەها جوتیارو کرێکار کە ئەو شارو ئەو شار دەسووڕانەوەلە پێناوی مسۆگەر کردنی ژیانێکی نەمرو نەژی بۆ خێزانەکانیانو ئازوقەی وەرزی نەهاتیش دابین بکەن بۆ ماڵو مندال ..

تەنانەت هەندێ جار ئەو جوتیارو هەژار لێقەوماوانەیش دەبوونە بارگرانی بەسەر کرێکاری شارو دیهاتەکانی تری وولاتو بەربەرەکانی ئەوانیان دەکرد ، چونکە ئەوان واتە جوتیارە لێ قەوماوەکان بە پارەیەکی کەمتر کاریان دەکردو ئیشی چاکتریشیان ئەنجام دەدا هەر بۆ ئەوەی تیکە نانێکی زیاتر بۆ دوا رۆژ پاشەکەوت بکەن ، بۆ زستانی تەڕو تووشو پڕ لە ساردو سڕی .. ئەمە وەنەبێ کە هەموو لێقەوماوەکان کاریان دەست کەوتبێو بە گیرفانی پڕو باخەلی گەرمو گوڕەوە بەرەو دیهاتەکانیان گەڕابنەوە ، نەخێر؛ بەلکو هی واشیان هەبووە کە هەر کاری دەست نەکەوتووەو بە دڵێکی ساردو بەدەستی بەتاڵەوە ڕووەو ماڵ بوونەتەوەو هەموو هەولو تەقلایەکیان مایە پووچ دەرچووەو ، لە بڕینی چەندین قۆناغ ڕێو دڵ تەنگی بەولاوە هیچی تریان بۆ نەماوەتەوە ، بەلام هەمدیس ئەوانە لەبەر باوەر بەخۆ بوونو ورە بەرزیەوە پەندو قسەی نەستەقی کوردیان لەبیر نەچوتەوەو بەوە دڵی خۆیان داوەتەوە کە «بەرد هەر لەجێی خۆی سەنگینە» ئیتر بەم شێوازە دڵتەنگی خۆیان ڕەواندوتەوەو تەنگو چەڵەمەی ژیانیان لەبیر خۆ بردوتەوە ..

جا هەر وەکو ووتمان ئەگەر بهاتایەو ساڵێك باران نەباریایە ئەوە لەهەموو ناوچەیەکی کوردوستان پەژارەو دڵتەنگی پەرەی دەسەندو هەر خێزانێك بیری لەوە دەکردەوە کە پێویستی خۆی لە دەغلو دان دابین بکا ، ئەمەیش لەبەر ئەوەی نەوەك ئەوساڵە باران دوابکەوێتو ببێتە هۆی نەهاتیو کەم بەرهەمی دەغلودانو مێوەو دانەوێڵەی تری پێویست ، تەنانەت ووشك بوونی پاوانو پەرێزەکانیش کارێکی ترسناکیان دەکردە سەر ژیانی ئاژەلو مەڕو مالاتی جوتیارەکان .. ئیتر هەر لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە باران چ دەورێکی کاریگەرو گرینگی هەیە لە بەرەو پێش چوونی باری ئابووری ژیانی هاوولاتیاندا ، ئەمە جگە لەو سوودو قازانجەی کە لە ئەنجامیدا وەگیریان دەکەوێو دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی باری ئابووری وولات بەگشتی .. جا گەر بهاتایە ساڵێ لە ساڵان بارانێکی چاك بباریایە ئەوە ئەو ساڵە خەلو خەرمان زۆر

دەبوو ، شیرو ماستو پەنیرو کەرەو ژاژیو لۆرو فرۆ هەر لەبران نەدەهات ، هەروەها بە درێژایی وەرزی بەهارو هاوینیش میوەجات لە برەودا دەبوو ، بەمەش خەڵکی دەکەوتنە ژیانێکی خۆشو بەختەوەرو دەگەشانەوە .. لە لایەکی تریشەوە هۆزو عەشیرەتە خێڵەکی یەکانیش کۆچو کۆچ باریان لێدەناو هۆبە بە هۆبە ، ئەو قۆناغو ئەو قۆناغ بەرێ دەکەوتنو دۆڵو کێو ڕێگەی دوورو درێژو سەختیان دەبڕی تا دەگەیشتنە کوێستانانو ئەووەرزەیان بەو پەڕی کامەرانی بەسەر دەبرد ..

دیمەنی جوانی ڕەشماڵەکانی کۆچەرایەتیو چیغە قامیشە ڕەنگاو ڕەنگەکەی دەورو پشتی ، مرۆڤی دەبردەوە جیهانێکی دیکەی پڕ لە خەیاڵاتی ڕۆمانسیانەو هەمیشە دوور لە خەمو ئازار ، ئەمانە هەمووی لە ئەنجامی باراندا سەریان هەڵ دەداو بە پێچەوانەش ئەو هۆزە خێڵەکیو کۆچەرانەیش هەروەك دانیشتوانی ناوچەکانی کوردوستان کە باسمان کردن خەمباری تەنگی پێ هەڵ دەچنینو دەربەدەر دەبوونو هەوارو کوێستانەکانیان گورگو ڕێوی قەڵەمبازیان تیادا دەکردو مەڕو ماڵاتیان هیلاك دەبوونو دەمردنو لەناو دەچوون ، چونکە بە ئاوو هەوای گەرمیان ڕا نەهاتبوون ..

دیمەنە دڵگیرەکانی تافگەو ئاوی ڕووبارەکانیش بە مەلوولیو کزییەوە دەهاتنە بەرچاوو زۆر کانیو کانیاوی سازگاریش ووشك دەبوونو مرۆڤ بەزەیی بەو دیمەنانە دەهاتەوە ، هەموو ئەو مێرگو چیمەنە بە گوڵە حاجیلەو میلاقو کنێرو وەنەوشە ڕازاوانەیش زەرد هەڵ دەگەڕانو ووشك دەبوون ..

ئیتر بۆ چارەسەرکردنی ئەو دیاردەیەو بۆ ئەوەی ئەو خەمبارییو داماوییە بەردەوام نەبێت ، خەڵکی شارو دیهاتەکان پەنایان دەبردە بەر هەندێ نەریتی واوە کە پەیوەندی هەیە بە ئاینەوە ، وە بە باوەری ئەوانەوە ئەو جۆرە نەریتانە بۆیان هەیە ببنە یارم[illegible]تی دەرێکی باش بۆ ئەوەی زامی دڵو دەروونیانی پێ س[illegible]ێژ بکەنو لەو دڵ تە نگیو خەمبارییەدا دەرچن ، وە لە[illegible] ئەوەی زوربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردوستان[illegible]نشینو کۆچەرەکانیشەوە بڕوایان بە ئایینی ئیسلامەوە [illegible]و ئیتر ئەو ساڵانەی کە هەست بکرایە باران کەم دەبێت ئە[illegible] لە هەموو لایەکەوە دەکەوتنە نوێژ کردن بۆ ئەوەی باران بباریێت کە ئەو نوێژەیش بریتی بوو لەوەی خەڵکی شارو لادێکان دەچوونە دەرەوە نێو کێڵگەیەکی نزیك ، پیاوان بەریز بەدوای مەلاو شێخەکانەوە دەوەستانو لەخوا دەپاڕانەوە تاوەکو بەزەییانی پیا بێتەوەو هەروەها بەزەیی بەو زەوییو زارو دەغڵو دانەوە بێتەوە کە لەبەر بێ بارانی خەریکە ووشك دەبن ئەو جوانیو قەشەنگیەیان لەدەست دەچێتو خەڵکیش لەبەر نەهاتی ئاوارەو دەربەدەر دەبێت .. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ئەم نوێژی باران بارینە تا ئێستاش لەگەڵێ ناوچەی کوردوستاندا باویەتیو بەگەرمییەوە ئەنجام دەدرێتو کاری پێ دەکرێ .. ئەمە وەنەبێ هەرتەنها نوێژی باران بارین لە ناوچەکانی کوردوستاندا باوبووبێت بەڵکو زۆر جۆر خۆپیشاندانی تریشی هەبوون لەوانەیش «کۆسەبەبە» وەیا «بووکە بە بارانێ» .

ئیتر لەبەر ئەوەی منیش تەنها لەبارەی «کۆسە بەبەوە» دەدوێمو ناوچەی هەولێریشم بۆ ئەم سەربردەیە هەڵبژاردووەو وا بەم شێوەیە بۆتانی دەگێڕمەوە :

«کۆسە بەبە ، بریتی بوو لەوەی کە پیاوێك یا چەند گەنجێکی تازە پێگەیشتوو خۆیانیان رووت دەکردەوە ، لە دەرپێ بەولاوە هیچی تریان لەبەردا نەدەما ، دەرپێکانیشیان تاوەکو ئەژنۆ هەڵ دەکرد ، سەری خۆیشیان بە گوێزان دەتاشی ، پاشان دەموو چاویان لەگەڵ پشتوو سنگیان تا ناوكو ، مەچەکی پێشەوە تاوەکو ئەژنۆ بە هیسی ڕەش یا تەنی مەنجەڵ ڕەش دەکردو خاڵ خاڵی سپیشیان بە پەمۆ لە هەموو گیانیاندا دورست دەکردو زەنگوڵەیەکی گەورەشیان بە ملا دەکردو کڵاوێکی قووچی بەوورده ئاوێنە ڕازێنراوەیشیان دەکردە سەرو کوتکێکی گەورەی داریشیان بە دەستەوە دەگرتو هەڵ دەپەڕین ، تاو تاویش کوتکەکەیان دەکێشا بە زەویداو بەتاو بەرەنگاری مرۆڤ دەبوونەوەو بە سەڵەواتو بە دەنگی بەرزەوە کوتکەکەیان ئەکێشا بەراستو چەپیەوە ، ئیتر هەموو ئەوانەی کە لە چوار دەوری کۆسە بەبە دەوەستان پەرت دەبوونو هەر یەکێ بە لایەکدا دەڕۆیشتن ، زۆر کەسی وا هەبوون کە بۆ یەکەم جار ئەو وێنەیان بدیایە ئەوەندە نەدەما لەترسانا بتۆقن ، چونکە بە ڕاستی وێنەیەکی تابلۆی ناشیرینو نارێکدەهاتە بەرچاو ، هەرکە دەکەوتە سەما کردنیش ئەو هەموو مندالانەی دەوریان دابوو تێکرا دەکەوتنە هەڵپەرینوو

سەما کردن و دەیان گووت :

«کوسە بەبە ستر بە . نانی دەخوا بە خورما»

ئەمەیان دەگوت و کوڵانە و کوڵان و ماڵە و ماڵ بەناو شاردا دەسورانەوە بە هەمان بەزم و سەماو هەڵپەرکێ ، لەولاشەوە خاوەن ماڵەکان هەندێکیان بە جامی ئاوەوەو هەندێکی تریان بە گۆزەوە دەهاتنە دەرەوەو ئاویان بەسەردا دەکردن ، جا گەر مروڤ بە ووردی سەرنجی دیمەنی کوسە بەبەی بدایە ئەوە زۆر شتی دەهاتە بەرچاو ، لە لایەك مەترسی لێ دەکرا واتە زۆر ترسناك بو و ، کەچی لە لایەکی ترەوە مروڤ بەزەیی پیان دەهاتەوە کە چۆن ئادەمیزاد لە دەستی قات و قڕی و گرانی کەوتنەوە خۆی دەکا بە پەندو تەنانەت رووی خۆیشی رەش دەکاو خۆی ریسواو شەرمەزار نیشان دەدا بۆ ئەوەی خوای میهرەبان لە کردەوە خراپەکانی ببورێ و بارانی بۆ ببارێنێت و بە خراپەی ئادەمیزاد نەکات ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ، بۆ ئەوەی دەغڵ و دان زۆر بێت و شادی و خۆشی کۆمەڵ بگرێتەوەو بەردەوام بێت ..

وە لەروانگەیەکی تریشەوە گەر بێتو لە ووشەی «کوسە بەبە ستر بە ، نانی دەخوا بە خورما» وورد ببینەوە ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە خورما چەند پێویستیەکی ژیانی ئادەمیزادی ئەوسا بووە ، ئەمە جگە لەوەی کە لە قورئانی پیرۆزیشدا ناوی دەبرێ ، هەروەها گەنمیش پێویستیەکی تری ژیانی ئادەمیزادو زوربەی هەرە زۆری گیان لەبەرانی ئەوساو ئیمرۆ یشە ..

هەروەها لەگەڵ هەڵپەرکی و سەماو بەزمی کوسە بەبەدا گۆرانی و بەندی خۆش خۆشی تر دەگوتران وەکوو :

**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا داکاتە باران**
**بۆ فەقیرو هەژاران**
**بۆ کوڵ و لالە زاران**
**بۆ سەیرانگای دڵداران**

* * *

**باران خێرو خێراتە**
**دەغڵ و دانی پێ هاتە**

* * *

یان دەیان گوت :

**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا دەباری باران**
**بۆ فەقیرو هەژاران**
**گەنمی حەسەن و حوسێنی**
**قربووە وا لە تینی**

* * *

لە کۆتایی ئەو بیرەوەری یە خۆشەمدا کە بۆم تۆمار کردن دەڵێم ، ئەگەرچی ئێستا وەکو سەردەمی رابردوو زۆر مەترسی لە نەبارینی باران ناکرێت ، چونکە دونیاو سەردەمی ئیمرۆ زۆر جیاوازە لەگەڵ جاران ، ئەویش لە ئەنجامی بەتین بوونی پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لە نێوان دەوڵەتاندا و دۆزینەوەی خێرا ترین هۆی هاتوچۆکردن و سەر هەڵدانی شێوازی تازەو پێشکەوتوو لە بواری ئاودێری و ئاودانی کشتووکاڵ و دۆزینەوەی تازەترین رێگە بۆ پێشخستنی بەرهەمی کشتووکاڵی و گەشەپێدانی ، وە ئەگەر ئەو نەریتە کۆنەی جاران «کوسە بەبە ، یا بووکە بە بارانێ» لە نێو کوردەواریدا کزبووەو باوی نەماوەو دانیشتوانی کوردوستان - جوتیارەکان - زیاتر روویان لە دێمەکار وەرگێراوەو وەکو جارانە پشت بە باران نابەستن ، بەلام ئەم نەریتە وەکو کەلەپوورێکی نەمرو سامانێکی میللی لە بواری کشتوکاڵدا وای بە چاك دەزانم لە بیری نەبەینەوەو تا بۆمان بکرێ پارێزگاری بکەین و تۆماری بکەین ، بۆ ئەوەی نەوەی تازە ئەوە بزانن کە باو باپیرانیان لە پێناوی گوزەران و ژیانێکی بەختەوەردا چ ئازارێکیان چەشتووەو چەند تاڵی و سوێری ژیانیان بینیووەو چۆنە پەنایان بردۆتە بەر جۆرەها رێگەو چۆن لە یەزدان پاراونەتەوەو رای گشتیشیان بۆ لای خۆیان راکیشاوە تاوەکو تێکراو بەیەك دەنگ تێبکۆشن بۆ ئامانجێك کە بەختەوەری هەموو لایەکی تیادا بەدی دێت ، هەروەها بۆ ئەوەی بزانن کە زانستی تازەو تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ چ دەورێکی مەزنیان هەیە بۆ پێشخستنی ژیان و گوزەرانی مروڤی ئیمرۆو چۆن رۆژ لە دوای رۆژ هەنگاوی خێراتر دەنرێت بۆ دۆزینەوەی شێوازی تازەترو بە سوودو قازانجتر بۆ تێکرای کۆمەڵگای هاوچەرخ و بنیاد نانی ژیانێکی سەرفرازو بەختەوەر .

● ڕووناك محمد ابراهیم ●

سلێمانی

## گلێنەیەک

تینوویەکم ...
لە قوڵایی دەریایەکان
سڕبوویەکم ...
لە گەرمایی بیابانەکان
وەکو ڕازێك
چاوە فرمێسکاویەکانم
بڕیوەتە تروسکەیەك
ئەبێ کەی بێ ؟
ئەو ئازارەی لەناو گیانما تواوەیە
ڕزگارم بێت
لەجێ چنگی بێ بەزەیی کەم بڕواکان
ئافرەتێکم ئەبێ بژیم
بەلام ژیان ...
لەبەر گڕی بێ دۆزەخی
سەرو گیانی بێ سووتانووم
کوڵە خەمی وەکو بارێك
کە نەی توانم
لەسەر شانی بێ خزانووم
بۆچی نابێ ، ڕازەکانم
وەکو ڕازی خۆشەویستێك بدرکێنم ..
هەرچی بڵێم بەڕەو ڕووی تۆن .
خۆشەویستە بێ بڕواکەم !
دڵی منیش وەك مۆمێکە
ڕۆژێك ئەبێ کۆتایی بێ ،
لەو ئاگرەی
بەناو گیانی ئەتوێتەوە ..
ڕزگار ئەبم ...
بەوەی کەمن خۆشم ئەوێت .

## پایزە کۆچ

● اکرم أسعد حمەمراد ●

هۆ گیانەکەم ..
پایزە کۆچت کردو ڕۆشتی !
وەك خوێن لە لەشم داچۆڕای
زامی دڵت سەختتر کرد
بۆیە تینووی عاشقە ئاووم
تاوەکو پێی بژیمەوە ..
سیامەندێکم :
هەموو هەوارگەیەك بەسەر دەکەمەوە
ڕێبوارێکی بەردەوامی سەر ڕێگاکانم
هەر ڕێبوارێك بەدی بکەم ،
ئەم پرسیارەم دەکەمەوە .
هۆ خەڵکینە ! ئەرێ ئێوە ؟!
هەواڵی خەجێ نازانن ؟
هۆ گیانەکەم :
بەدوای تۆدا
لەگشت جێ ژوانێکی جاران
لەسەر مەزاری عاشقان
لەگەڵ بەزمی شەوانی زوو
ئێشك دەگرم ..
لە دووری تۆ .
وەك پەروانە بە دەوری شەم
دەخولێمەوەو دەسووتێمو گڕ دادەگرم
گڕ دادەگرم ...

# چەتر

**فخرالدين محي الدين**
**کەرکووک**

شاعیرێك و کیژۆڵەیەك
دەستیان کردە ملی نەرمە بارانێك و
کوچی هێمنی عەشقیان دەستی پێکرد ..
کە چاو سوورەکان زانییان
عەشقەکەیان دەبێتە چەتری بەر باران
لێکیان جوودا کردنەوە
شاعیریان زیندان بەند کردو
لە کیژۆڵە سەر شێتەکە دایان بڕی ...
کیژۆڵەکەش
سەراسیمە بەجێیان هێشت بۆ مەینەتی .. ،
زستانی سەختی وڵاتی خۆشەویستی ..
بەڵام کە باران دەباری
بیرەوەرییە نەمرەکان
دا دەبارین بەسەر خاکە پیرۆزەکەی
دڵی ناسکی ئەمداو
زیاتر دبووە ئاوێزانی باران بارین ..
شاعیرەکەش
هەتاکو لە تاڵێ تیشکی
پەنجەرەی ئا ئەو زیندانە
بێ بەری بوو ..
پەردەی تەنکی رەش بینی
نە دەهاتنە سەر چاوانی
چونکە بارتەقای پەنجەرەی ،
هۆنراوە مەزنەکانی خۆی دەکردەوەو
دەیکردەوە بە یادگاری
بۆ ئا ئەو کیژۆڵە شێتەی
ئاوێزانی باران ببوو ..
تاکو هەردووکیان
خاکی مەزنی
بکەن بە چەتر بۆ سەری ،
هەر هەموو عاشقەکانی ئەم دونیایە !

# ئەرێ کەنگی

**اسماعیل حسین محمد**
**دهوك**

●

ئەرێ کەنگی ... ؟
شرینا من
دێ گهوری ئەڤی ڕەنگی
شوینا کولا
کەیە دیلانێ ، کەیە شاهی
ل عەسمانێ ئەڤی دلی
عەورا ڕادەی ، کەیە ساهی
ئەڤێ ژینا
د ناڤ تاریادا خەندقی
کەنگی دێ لێ بیت ڕۆناهی
بێژە کەنگی ...؟
تو دێ دەرکەی
کولێت دناڤ ئەڤی سینگی
دێ دەرمان کەی
ڤێ برینا ژ خوینێ پەنگی

●

ئەرێ کەنگی ... ؟
دێ بی خوییا
فرەك ژ شادی و خوشیا
هلو ڕابە
ل گەل دلی ببە سیار
چاڤێت هندە سالە کورە
ببە گوڤەندا بیناهیا
ببە شاهیا

●

ئەرێ کەنگی
شرینا من
دێ ژ کولا بێیە بیانی
ڕابە لەزکە.
تۆژی بگێرە ئەزمانی
ل ناڤ بەرا
هەر چار ڕەخا
ل وارێ خۆیکە ئەرزانی
زڤستان هات
دڤێت تو بگێری بانی
دا دلوپا نەکەت خانی




● ئارام اسماعیل محمد ●

سلێمانی / 1982

شەوەو ...
سێڵەکانی سەرم گوڕوە خەمێکیان گرتووە
بۆم دابین نابن .
لە خامە شکاوەکەم زیاتر هیچ شك نابەم
ئەی خامە خانەخوێکەم ، هاتووم
دەبمە پەناهەندەی شاری شیعر
ڕێم بە ، ئەوەی لە قوڵایی ناخم دایە
ببێ بە گوڵە شیعرێ .. بۆ هاتنەوەت
بیدەم لەو کەزیەو پەرچەمە ژاکاوەت
شەوەو ...
ئاوێزەی سەرم ، خۆرە شیعری تیا وون ئەبێ

ئەی میوانە ، شیرینەکەم .
کەتۆ تا ئێستا شیعرێکی وون بیو
منیش گوزرە تیشکێکی بێ مەدار
جا ئیتر شەرم بۆ :
پارویە شیعرو
هەنسکێکی سوێرو
خەمێکی ئازاد
سەرە ڕێی ماڵی چ خۆرێ بگرێ

* * *

شەوەو ...
بە هیوای خەندەیەکی فێنك هەڵکا
چاوەکانم چەقی سەر ڕێی شیعریان گرتووە .
دە ئەی خامە خانەخوێکەم
سوێندت ئەدەم بەو مرۆڤەی
کە خەمی مرۆڤی لەلا گەورەترین عەشقە
نەکەی .. نائومێدم بکەی
ئەم خەمو ئازارە زۆرەی
ژانە شیعرم بەبا بدەی

* * *

شەوەو ...
خەمە وەریوەکانم خەزانی تۆیە ... بۆم ناپێورێ
دڵم بەقەد گەورەیی تۆیە ... بۆم ناپێورێ
خۆشەویستی تۆ گڕە شیعرە ... بۆم ناپێورێ
چونکە نە خەمو ، نە خۆشەویستی تۆو ،
نە شیعریشم بۆ پێوراوە .

# ڕوانگەو دووربینی ئاسمانی

## « تەلیسکۆپ »

● گۆڕینی : کەمال جەلال غەریب ●



... ووشەی تەلیسکۆپ لە پێشگری «— Tele» واتا «دوور» و پاشگری «Scope —» واتا بینین پێك دێت ، کەوابوو مانای تەلیسکۆپ «دووربین» دەگرێتەوە ، بە تایبەتی دووربینی ئەستێرەوانی یان ئاسمانی . تەلیسکۆپ ئامرازێکی سەرەکی یە لە لایەن ئەستیرەوانەکانەوە ، بۆ تێڕوانینو لێکۆڵینەوە لە تەنە ئاسمانی یەکان Celestial بەکار دەهێنرێت ، بە کۆکردنەوەی رووناکی لەو تەنە ئاسمانی یانە خۆیان یان وێنەکانیان . تەلیسکۆپ لە زەرە بینێکی «عدسة = Lens» شتێنە ، «عدسة شيئية ـ Objective ، چونکە بەرەو ئەو شتە ئاراستە دەکرێت کە دەمانەوێت ببینین» پێکهاتووە ، فرمانەکەی کۆکردنەوەی رووناکی و پێکهێنانی وێنەی تەنە ئاسمانی یەکانە لە تیشکۆ «بۆرە = Focus» دا . هەروەها لە زەرەبینێکی چاوێنە «عدسة عينية eyepiece — چونکە تەماشاکەرەکە چاوی پێوە دەنێت» ، فرمانی ئەمیش گەورە کردنی وێنەکەیە .

ئەگەر شتێنەکە زەرەبین بوو ئەوا تەلیسکۆپەکە پێی دەووترێت تەلیسکۆپی شکێنەرەوە «Refractor» بەلام ئەگەر شتێنەکە ئاوێنە بوو ئەوساکە تەلیسکۆپەکە پێی دەووترێت

تەلیسکۆپی رەنکەرەوە «Refractor» بەلام ئەگەر شتێنەکە ئاوێنە بوو ئەوسـاکە تـەلیسکۆپـەکە پێی دەووتـرێت تەلیسـکـۆپی رەنکەرەوە «Reflector» . دەشێت تەلیسکۆپ جگە لە تەماشاکردن بۆ وێنە گرتنیش بەکار بێت ، بەلام لەم بارەدا هەنـدێك جـار پێویست بە بەکار هێنانی دامو دەزگای یاریدەدەری دەکا وەکوو کامێراو ئامرازی کارۆ رووناکی «کهرو ضوئیـة «Photo electric» وشە بەنگ پێو «مقیاس الطیف Spectrometer» .

● دامەزراندنی «ڕاگرتنی» تەلیسکۆپ

**mounting of telescope**

گەلێك رێگە هەیە بۆ دامەزراندنی تەلیسکۆپ . رادەی قایمی و جێگیری و توانای ئـاراستەکـردن بە هـەموو لایـەکی ئاسماندا کارێکی بنەرەتی یە لە دامەزراندنی تەلیسکۆپدا ، بۆ ئەوەی کە ئەو تەلیسـکـۆپە سـوود بەخشی بێت لە تێـروانینی ئاسمان و ئەستێرەکاندا . تەلیسکۆپی یەکجار بچووك بەدەست هەڵدەگیرێت ، ئەگەر لەوە گەورەتر بوو دەشێت لە سەر سێپا دابنـرێت . بەلام تـەلیسکۆپـە مەزنـەکان دەبێت لە شـوێنی تایبەتیدا دابمەزرێنرێن . ئەو تەلیسکۆپەی کە بـۆ تێروانینی مانگو ئەستێرە جێگیرەکان و گەرۆکەکـان بەکـار دێت دەبێت بەردەوام لە خولانەوەدا بێت بۆ ئەوەی کە هەمیشە شوێن ئەو تەنە ئاسمانی یە بکەوێت . هۆی ئەمەش تەنها هەر ئەوە نی یە ئەو تەنە ئاسمانی یانە بەردەوام لە خولانەوەدان ، بەڵکو هۆیە سەرەکی یەکەی ئەوەیە کە ئێمەش لەسەر سەکۆیەکی خولاوە (واتا زەوی) وەستاوین و لەو تەنە ئاسمانی یانە دەروانین .

خولانەوە روالەتەکەی «رووکەش» خۆر لە خۆر هەلاتەوە بۆ خۆر ئاوا ئەگەر بە چاوێکی رووت «بەبێ دووربین» سەیری بکرێت یەکجار هێواش دیارە ، بەلام بە تەلیسکـۆپ زۆر خێرا دیار دەبێت ، هەروەها ئەو رووبەرەی کە لە ئاسمان دەبینرێت بە چاوێنەی تەلیسکوپ یەکجار تەسك دیار دەبێت .

هەتا هێزی گەورەکردنی تەلیسکۆپ زیاتر بێت ئەوا ئەو رووبەرە بچوکتر دەبێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کـەوا دەربکەوێت تەنە ئاسمانی یەکە زۆر خێراترە ، ئێمە کە لەسەر زەوی دەروانینە شتێك ، بۆ نموونە ، سەعاتی بورجێك هەست بە جوولانەوەکەی «خولانەوەکەی» ناکەین ، چونکە ئێمەش و سـەعاتـەکەش هـەردووکمـان پێکـەوە بـەهـەمـان خێـرایی دەجوولێنەوە ، لەبەر ئەوە خێرایی رێژەی هەر وەکوو نـەبێت وایە .. دامەزراندنی تەلیسکۆپ بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە بتوانین بە باری تانی «قیتی ـ azimuth»و پۆپیشدا «ئاسـۆیی ـ altitude» بیخولێنیەوە ، پێی دەووترێت دامەزراندنی باری تان پۆیی ـ ALTAZIMUT H — Mounting .

بەلام بە شێوەیەکی گشتی ، تەلیسکۆپـە گەورەکـان ، هـەندێـك جـار بچـووکـەکـانیش ، بـە بـاری یـەکسـانیـدا «إستوائی = equatorial» دادەمەزرێنرێن ، لەم بارەیەدا یەکێك لە تەوەرەکانی «محور» تەلیسکۆپەکە بە شێوەیەکی تەریبی بە تـەوەرەی زەوی دەمێنێتەوە . بـەم جـۆرە تـەلیسکـۆپـەکـە دەتوانێت شوێن تەنە ئاسمانی یەکە بکەوێت لەسەر رێبازێکی چەماوە تەنها بە یەك جوولە لە جیاتی دووان . ئەم جوڵەیەش بە شێوەیەکی میکانیکی بە هۆی جوولێنەرێکی «محرك» کارەبایی بچووك یان ئامرازی ئیش پێکردنی کات ژمێر «سەعات» بەهۆی قورسایی یەوە ، پێك دێت . بە زۆری تەلیسکۆپێکی . بچووکی یاریدەدەر لە سەر بۆری ی تەلیسکۆپی گەورە دادەمەزرێنرێت بۆ ئەوەی کە یارمەتی تەلیسکۆپە گەورەکە بدات لە خێرا دەست نیشان کردن و تێراوانینی تەنە ئاسمانی یەکاندا . تـەلیسکۆپی ئاسمانی Astronomical telescope وێنەی تەنە ئاسمـانی یەکـان بە هـەلگێراوەیی واتـا سـەرەو خـوار پیشـان دەدات ، کـەچی تەلیسکۆپی زەوی یەوانی . Terrestrial tel وێنەکە بە شێوەیەکی ئـاسایی واتـا رێك و پێـك نیشان دەدات . ئـەو تەلیسکـۆپـە شکێنەرەوەیەی کە لە روانگەی «یرکس» لە ناوچەی وسکنن لە وولاتـە یـەککـرتـووەکـانی ئـەمـریکـادا لە سـالی 1897دا دامەزرێنرراوەو تیرەی زەرەبینەکەی «40» ئینجە هەتا ئێستا بە گـەورەترینی ئـەم جۆرە تـەلیسکۆپـە دادەنرێت . بـەلام وا چاوەڕوان دەکرێت کە لە دوا رۆژدا ئیتر لەم جۆرە تەلیسکۆپە دروست نـەکـرێت چـونکـە دروستکـردن و ئیش پێکـردنی تەلیسکۆپی رەت کەرەوەی ئاوێنە تێرە گەورەتر ئاسانتـرە . گەورەترین تەلیسکۆپی رەتکـەرەوە لە دەرەوەی ئەورووپـادا ئەوەیە کە لە روانگەی پالۆمار لە کالیفۆرنیا لە ئەمریکادا هەیەو تیرەی ئاوێنەکەی «200» ئینجە . بەلام گەورەترین تەلیسکۆپی رەتکەرەوەی جیهانی کـە تیرەی ئـاوێنەکـەی «236» ئینجە لە چیـاکانی قـەفقاسیـا لە یەکیـەتی سـۆڤیەتیدا هـەیـە . بـە گەشەکردن و پێشکەوتنی کەشتی بۆشایی «Spacecraft» ئیمرۆ لە تواناداهەیە کە تەلیسکۆپ رەوانە بکرێت بۆ ناو بۆشایی ئاسمان

و ت بۆ سەرووی چینی کەشی ی atmosphere زەوی بۆ زامن کردنی تیروانینێکی ئەوتۆ کە بارەکانی کەشکاریان تێ نەکردبێت . هەروەها جۆرە تەلیسکۆپێکی تریش هەیە کە پێی دەووترێت تەلیسکۆپی خۆریی . solar tel وەکوو تەلیسکۆپی میللی «مکماث» ە روانگەی «کیت پیك» لە ئەریزۆنا لە ئەمریکا ، لەم جۆرەدا ڕووناکی خۆر لە سیلۆستاتێکەوە «Coelostat» کە لە لوتکەی برجەکەدا هەیە بە تونێلێکی «نفق» لێژدا دەچێتە خوارەوە .

● **سیلوستان** :

ئاوێنەیەکە بە دەوری تەوەرەکەیدا لەسەر ڕووە تەختەکەی خۆی دەخولێتەوەو بەرەو ئاسمان ئاراستە دەکرێت ، ئیشەکەی ئەوەیە کە بەردەوام وێنەی هەمان ناوچەی ئاسمان ڕەت دەکاتەوە بەرەو کایەی «مەیانی» بینین «Field of View» لە تەلیسکۆپی جێگیرکراودا .

● **تەلیسکۆپ لە مێژوودا** :

وەکوو زانراوە لە سالی 1608 دا دەست کراوە بە دروست کردنی تەلیسکۆپ هەرچەندە بە تەواوەتی نەزانراوە کە کێ یەکەم کەس بووە لە دروست کردنی تەلیسکۆپدا ، بەلام ئەوەی ئا شکرایە زەڕەبینی شووشە بەرلەم مێژووە بە چەندەها سەدە زانراوەو بەکاریش هێنراوە لە دروست کردنی چاوێلکەدا . لەوانەی کە ئاوێنەو زەڕەبینیان لە مەیانی تاقی کردنەوەدا بەکارهێناوە «أبا الحسن بن الهیثم 965 — 1039» و «ڕۆجەر بیکۆن 1210 — 1294» و «لیۆنارد دیجس 1510 — 1555» ، بەلام لە هەمووی ڕاستتر ئەوەیە کە بەدی هێنانی بیرورڕای دروست کردنی تەلیسکۆپ دەگەرێتەوە بۆ چاوێلکە سازی هۆلەندی «هانز لیپەرزش Hans Lippershey» هەرچەندە کە هەڤالو هاونیشتمانییەکەی «زەکەریا جانسن» وای دەردەخات کە خۆی یەکەم کەس بووە لەم مەیدانەدا . وای دەگێڕنەوە کە جارێکیان بەرێکەوت ، لیپیرشی دوو زەڕەبینی بەدەستەوە دەبێتو ئاراستەی بورجی کلێسەیەکی دووریان دەکان ، واهەست دەکات کە بورجەکە لێی نزیك دەبێتەوە ، ئەم دیاردەیە سەرنجی لیپیرشی ڕادەکێشێت ، ئنجا بۆ ئەوەی کارەکەی بە ڕێکوپێکی بڕوات دوو زەڕەبینەکە لە بۆرییەکدا جێگیر دەکات ، دەتوانین بلێین کە ئەمە یەکەم دووربین «تەلیسکۆپ» بووە کە لە جیهاندا لە سالی 1608 دا هاتۆتە کایەوە .. کە دەنگو باسی ئەم دووربینەو ڕێگەی دروست کردنەکەی لە ئەوروپادا بلاودەبێتەوە دەنگەکە دەگاتە زانای بیرکاری «گالیلۆ گالیلی» کە لەو کاتەدا لە سالی 1609دا بەسەردانێکی کورت لە شاری ڤینیسیا بووە ، کە گالیلۆ گەرایەوە بۆ شارەکەی خۆی «بادوا» خێرا دەستی کرد بە دروست کردنی دوور بینێك لەم جۆرە «هەرگالیلۆشە کە ئەم ئامرازەی ناو ناوە تەلیسکۆپ = واتا دووربین» بە بەکار هێنانی زەڕەبینێکی قۆقز «بۆشتێنەکەی» و زەڕەبینێکی ڕوو چال «بۆ چاوێنەکەی» بەوە تەلیسکۆپێکی دەستکەوت کە «3» جار شت گەورە دەکات ، دوای ئەوە یەکێکی تری دروست کرد کە «8» جار و ئنجا یەکێکی تر کە «33» جار شتی گەورە دەکرد ، بەهۆی ئەم تەلیسکۆپەوە کە لە سالی 1610 دا دروستی کرد ، سەیری گومەزی ئاسمانی پێ کردو گەلێك دیاردەو ڕاستی گرنگو سەر سوڕهێنەری بۆ دەرکەوت ، لەمانەش تەماشا کردنی ڕووی مانگو بینینی شاخو چیاکانی بوو ، هەروەها بینینی چوار پاشکۆکەی ئەستێرەی بەرجیس «مشتری Jupiter» ، جگە لە بینینی پەلەکانی ڕووی خۆرو ڕووی ئەستێرەی نامی «زهرە Venus» سەرەڕای ئەمە بۆی دەرکەوت کە هەندێك تەنی نائاسایی لە دەوروپشتی ئەستێرەی کەیوان «زحل Saturn» هەن ، لە دواییدا دەرکەوت کە ئەمانە کۆمەلە ئەلقەیەکی جوانو ڕەنگینی دەوری ئەستێرەی کەیوانیان داوەو بەدەوریا دەخولێنەوە ، بەم جۆرە تەلیسکۆپ بوو بەئامرازێك بۆ دۆزینەوەو لێکۆلینەوەی زانیاری نەوەك تەنها چەکێك بێت لە مەیانی جەنگدا سوودی لێ وەربگیرێت .

● **زەڕەبین وێنە دروست دەکات** :ـ

چاوی ئادەمیزاد هەتا ڕادەیەك لە تەلیسکۆپ دەچێت هەروەها بەڕێگەی ئیش کردنەکەیدا لە کامێراش دەچێت . لەبەشی پێشەوەی چاودا زەڕەبینێك هەیە کە پێشوازی لە ڕووناکی تەنە بینراوەکە دەکاتو لەسەر بەشی دواوەی تۆڕینە «شبکیە Retina» کە بریتیە لە چینی ناوەوەی گلێنەی چاو ، ئەو ڕووناکییە کۆ دەکاتەوە .. تۆڕینەش وەکوو پەردەیەکی هەستیار وێنەی تەنەکەی بە شێوەیەکی هەلەوگێڕراوە «وەکوو تەلیسکۆپو کامیرا» تیادا دروست دەبێت ، بەلام ئێمە وێنەی شتومەك بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دەبینین چونکە لە مێشکدا وێنە هەلگەراوەکە ڕێك دەبێتەوە ، زەڕەبینەکەی پێشەوەی تەلیسکۆپەکە کە پێی دەووترێت شتێنە Object glass گەلێك لە بیلبیلەی چاو گەورەترە ، لەبەر ئەوە گەلێك زیاتر ڕووناکی کۆ

دەكاتەوە ، بۆ نموونە ئەو شتێنەیەی كە تیرەكەی «5» سانتی مەترە سەد ئەوەندە بەڵكو زیاتریش لە ڕووناكی كۆ دەكاتەوە وەك لە بیلبیلەی چاو ، ئەو تیشكی ڕووناكی یەی كە بە شتێنەی تەلیسكۆپدا تێپەڕ دەبێت دەشكێتەوەو لە تیشكۆدا كۆ دەبێتەوە ، دووری تیشكۆ لە زەرەبینەكەوە پێی دەووترێت دووری تیشكۆیی (Focal length البعد البؤري) ئا لەم تیشكۆیەدا (لەم خاڵەدا) وێنەی شتەكە پەیدا . دەبێت هەروەها لە تەلیسكۆپدا زەرەبینێكی بچووكتر لە شتێنەدا هەیە كە دووری تیشكۆیی یەكەی زۆر كەمترە ، دەخرێتە پشت تیشكۆی زەرەبینە شتێنەكەوە ، پێی دەووترێت چاوێنە «eye Piece» واتا چاوی پێوە دەنرێت بۆ تەماشاكردن ، ئیشی ئەمەیان ئەوەیە كە وێنەی شتە بینراوەكە گەورە دەكات . زۆر جار تەلیسكۆپی سادەو ساكار لەم دوو جۆرە زەرەبینەو دوو بۆری ، كە بەرێكی بە یەكتریدا بچن ، دروست دەكرێت . دەبێت ئەوەش بزانین كە زەرەبین گەلێك جۆری هەیە ، ئەم جۆرانەش لە بارەی قەبارەو رێگەی دروست كردن و جۆری شووشەكەدا لە یەكتری جیاوازن .

● جۆرو شێوەكانی تەلیسكۆپ :-

1 - تەلیسكۆپی رەتكەرەوە :-

ئەم جۆرە تەلیسكۆپە لە بۆرییەكی كانزایی پێكهاتووە كە لە بەشی خوارەوەیدا ئاوێنەیەكی شتێنەی ڕووچاڵ لە شێوەی برگە هاوەڵدا «القطع المكافئ Parabola»ی تیادا قایم كراوە ، ئەم ئاوێنەیە پێشوازی ئەو چەپكە ڕووناكییانە دەكات كە لە ئاسمانییەكانەوە دێنە دەرەوەو بۆ سەرەوەی بۆرییەكە رەتیان دەكاتەوە . لەوێدا ئاوێنەیەكی بچووكی ڕوو تەخت كە بە شێوەیەكی لار دانراوە لە چا وئاوێنە سەرەكییە گەورەكەدا بەرەنگاریان دەبێت و بەرەو كونی بۆرییەكی لاتەنیشت ، كە زەرەبینێكی چاوێنەی تیادایە ، رەتیان دەكاتەوە . لێرەدا ، واتە لە بەیەك گەیشتنی هەردوو تیشكۆكە ، وێنەیەكی ڕاستەقینە بۆ تەنەكە پەیدا دەبێت ئنجا زەرەبینە چاوێنەكە بە شێوەیەكی گەورەكراوو هەڵەگێڕاوەوە دەینێرێت بۆ چاوی سەیركەرەكە ئەم جۆرە تەلیسكۆپە پێی دەووترێت «رەتكەرەوەی نیوتن - Newto-nian reflector» .

گەورەترین تەلیسكۆپی رەتكەرەو ئەوەیە كە لە چیای پالۆمار لە ئەمریكا هەیە كە تیرەی ئاوێنەكەی «508» سانتیمەترەو ئەوەی لە چیای ولسن لە ئەمریكادا هەیە ، تیرەی ئاوێنەكەی «100» ئینجەو جگە لەو تەلیسكۆپە رەتكەرەوەیەی كە لەم ساڵانی دواییەدا لە یەكیەتی سۆڤیەت دامەزرێنراوەو تیرەی ئاوێنەكەی «236» ئینجە .

2 - تەلسكۆپی شكێنەرەوە Refracting Telescope

ئەم جۆرە تەلیسكۆپە لە دوو زەرەبینی كۆكەرەوە «قۆقز» - ((Converging lens ((Convex یەكێكیان گەورەیە دووری تیشكۆیی یەكەی «بعد بؤري» زۆرە ، لە جەمسەرێكی بۆرییەكی كانزایی درێژدا قایمكراوە ، پێی دەووترێت زەرەبینی شتێنە ، چونكە پێشوازی لە ڕووناكی ئەو شتە دەكان كە دەمانەوێت ببینین ، ئەوی تریانی لە چاو یەكەمدا بچوكترە لە ڕووبەرو لە تیشكۆدا لە جەمسەرەكەی تری بۆرییەكەدا قایمكراوە پێی دەووترێت زەرەبینی چاوێنە ، چونكە سەیركەرەكە چاوی پێوە دەنێت لە كاتی تێڕوانیندا .

ڕووناكی تەنە ئاسمانییە دوورەكان بە شێوەی چەپكی ڕاستی تەریبی دێن و بەر زەرەبینە شتێنەكە دەكەون و پیایدا گوزەر دەكەن و لە چەقی «مركز» تیشكۆكەیدا لە ناو بۆرییەكەدا كۆ دەبنەوە ، بەوە وێنەیەكی سەرەتایی ڕاستەقینەی هەڵەوگێڕراوە بۆ ئەو تەنە ئاسمانییە دروست دەبێت . ئنجا كە تیشكۆی زەرەبینە چاوێنەكە لە گەڵ تیشكۆی زەرەبینە شتێنەكە بەیەك دەگەن وێنە سەرەتاییەكە گەورەو ئاشكراتر دەبێت ، وەكوو تەلیسكۆپە شكێنەرەوەكەی ڕوانگەی «یركس»

● هەندێك جیاوازی لە نێوانی تەلیسكۆپی رەتكەرەوەو تەلیسكۆپی شكێنەرەوەدا

1 تەلیسكۆپی شكێنەرەوە سووكترە وەك لە هی رەتكەرەوە .
2 تەلیسكۆپی شكێنەرەوە وێنەكە زۆر باش ئاشكرا دەكات و كایەی بینینی تیادا فراوانترە .
3 زەرەبینی شتێنەی تەلیسكۆپی شكێنەرەوە توانای مژینی ئەو ڕووناكییەی هەیە كە پیایدا تێپەڕ دەبێت و ناهێڵێت وون ببێت وەكوو لە ئاوێنەی تەلیسكۆپی رەتكەرەوەدا .

4 زەرەبینە شتێنەکە لە تەلیسکۆپی شکێنەرەوەدا لە شوێنەکەی خۆیدا جێگیرکراوە ، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات دەستکاری بکرێت و رێك بخرێت ، هەروەها پێویستیش بە بۆیە «رووکەش» کردن ناکات بە پێچەوانەی ئاوێنە شتێنەکەی تەلیسکۆپی رەتکەرەوە کە بەردەوام پێویستی بە ئاگاداری و رێك خستن و ناوبەناو بۆیە کردنەوە هەیە .

5 ئاوێنە شتێنەکەی تەلیسکۆپی رەتکەرەوە پێنج یەکی پارەی زەرەبینە شتێنەکەی تەلیسکۆپی شکێنەرەوەی تێ دەچێت ...

6 دەشێت ئاوێنەی تەلیسکۆپی رەتکەرەوە لەهەر جۆرە شووشەیەکی باش دوروست بکرێت ، بەلام زەرەبینی تەلیسکۆپی شکێنەرەوە دەبێت لە باشترین جۆری شووشە دروست بکرێت و ئەو شووشەیە هیچ جۆرە بلق و نارێکی یەکی تیادا نەبێت و زۆر بەباشی ساف بکرێت .

7 دەمەگۆشەی «فتحة زاوية» تەلیسکۆپی رەتکەرەوە لە هینی شکێنەرەوە گەورەترەو ئاشکرایە کە فراوانی ئەم دەمە گرنگی یەکی زۆری هەیە لە تێروانینی ئەو ئەستێرە دوورانەدا کە رووناکی یەکەیان کزە چونکە وێنەی بەهێزو ئاشکرا یان بۆ پێك دەهێنێت .

جا لەبەر ئەم سیفەتە باشانەی کە لە ئاوێنەدا هەیە دەبینین زاناکان ئیمرۆ بەرەو ئەوە دەڕۆن کە تەلیسکۆپی رەتکەرەوەی مەزن لە روانگە ئەستێرەوانی یە گرنگەکاندا دروست بکەن ، جاری واهەیە تیرەی ئەم ئاوێنەیە دەگاتە «236» ئینج وەکوو تیرەی ئاوێنەی ئەو تەلیسکۆپە رەتکەرەوە مەزنەی کە لە ناوچەی ئەرمینیا لە یەکێتی سۆڤیەتدا هەیە کە بە گەورەترین تەلیسکۆپی جیهانی دادەنرێت ...

3 ● تەلیسکۆپی کاسیگرینی : Cassegrain tel

تەلیسکۆپێکە لە جۆری رەتکەرەوە لەلایەن کاسیگرینی فەرەنسی یەوە لە ساڵی 1672 دا داهێنراوە . لێرەدا ئەو رووناکی یەی کە بەر ئاوێنەیەکی سەرەکی لەشێوەی برگە هاوتا واتا لەتە بەرەو «قطع مكافئ Parabolic» دەکەوێت لەلایەن ئاوێنەیەکی ناوەنجی روو چاڵەوە بۆ دواوە رەت دەبێتەوە بە کونێکدا لە ئاوێنە سەرەکی یەکەدا ، ئنجا بەرەو تیشکۆیەك دەڕوات کە پێی دەووترێت «تیشکۆی کاسیگرینی» لەسەر تەوەرەی تەلیسکۆپەکەو لێرەدا لە تواناداهەیە کە وێنەکە بە چاو یان بە ئامراز ببینرێت . گەورەترین تەلیسکۆپی بەریتانی لە روانگەی شایانە لە ناوچەی سیکس کە تیرەی ئاوێنەکەی «244» سانتیمەترە لەسەر شێوازی کاسیگرینی دروستکراوە .

4 ـ تەلیسکۆپی گریگۆری : Gregorian

تەلیسکۆپێکی رەتکەرەوەیە لە ساڵی (1638 — 1675)دا لە لایەن ج . گریگۆری ، کە زانایەکی بیرکاری ئوسکوتلەندی یە ، نەخشەی کێشراوە ، پێنج ساڵ بەر لەوەی کە زانا ئیسحاق نیوتن تەلیسکۆپە رەتکەرەوەکەی خۆی دابمەزرێنێت . ئاوێنە سەرەکی یەکەی لە شێوەی برگە هاوتا دایەو کونێکی لە ناوەراستدا تیادایە ئەو رووناکی یەی کە بەر ئەم ئاوێنەیە دەکەوێت بەرەو ئاوێنەیەکی ناوەنجی لە شێوەی نیمچە هیلکەیی شێوەی شێلمی برگەی ناتەواو «قطع ناقص ellipsoidal» روو چاڵی ئەوتۆ رەت دەبێتەوە کە لە سەر هەمان تەوەرە راگیرکراوەو بۆ دواوە رەت دەبێتەوە بە ناو کونێکدا کە لە ئاوێنە سەرەکی یەکەدا هەیەو بەرەو چاوێنەکە دەڕوات ، وێنەکەشی بە شێوەیەکی رێك «قیت» پێکدێت .

ئێستا ئەم جۆرە تەلیسکۆپە بۆ مەبەستی تێروانینی ئەستێرەکان بەکار ناهێنرێت چونکە هەڵگرتن و ئیش پێکردنی زەحمەتە ، لەبەر ئەوە ئێستاکە تەنها لە مۆزەخانەکاندا دەبینرێت ، جیاوازی ئەم جۆرە لە گەڵ تەلیسکۆپی کاسیگرینی دا ئەوەیە کە ئاوێنە ناوەنجی یەکەی ئەم رووەکەی چاڵە نەوەك قۆقز .

5 ـ تەلیسکۆپی نیوتنی ـ کاسیگرینی :

New tonian — Cassegrain tel

أ ـ جۆرێکی دەستکاری کراوە لە تەلیسکۆپی کاسیگرینی کە تیایدا رووناکی یەکە لە ئاوێنەیەکی ناوەنجی یەوە بۆ خوارەوە بە بۆری یەکدا رەت دەبێتەوە بەرەو ئاوێنەیەکی تەخت کە بە لاری «45» پلە دانراوە . ئەمە دەبێتە هۆی ئاراستەکردنی تیشکەکان بەرەو تیشکۆی نیوتنی «البؤرة النيوتنية» لە تەنیشتی بۆری یەکەوە نزیکی ئاوێنە سەرەکی یەکە . .

بەم جۆرە ، وەکوو لە نەخشەکەی کاسیگرینیدا ، چارەسەری رادەی گوزەرکاری Piercing ئاوێنە سەرەکی‌یەکە دەکرێت .

ب ـ تەلیسکۆپێکی رەتکەرەوەی گەورەیە بەجۆرێکی ئەوتۆ رێکخراوە کە بە شێوەی تەلیسکۆپی نیوتنی یان بە *ـوەی تەلیسکۆپی کاسیگرینی سوودی لێ وەربگیرێت .

6 ـ **تەلیسکۆپی نیوتن** : Newtonian tel :ـ

ئەم جۆرە ساکارترین شێوەی تەلیسکۆپی رەتکەرەوەیە . لە سەرەتادا لە لایەن زانا نیوتنەوە لە ساڵی 1668دا دروستکراوە لە شێوە بنچینەیی‌یەکەیدا لە ئاوێنەیەکی سەرەکی کانزایی ـ «برونز یان زیپو» ـ خڕی روو چاڵی ئەوتۆ پێکهاتووە کە روونــاکی بـۆ سـەرەوەی بـۆری تەلیسکۆپەکە رەت دەکاتەوە . ئاوێنەیەکی کانزایی تەختی بەلاریی «45» پلە تیا دانراوە ، ئاوێنەکە رووناکی بەرەو تەنیشتی بۆری‌یەکە ئاراستە دەکان ، لەوێدا وێنەی تەنە ئاسمانی‌یەکە بەهۆی چاوێنەیەکی رێك ـ قۆقزی ـ «مستوية محدبة ـ Planocon vex» ـ بچووکەوە دەبینرێت .

7 ـ **تەلیسکۆپی گالیلۆ** Galilean tel :ـ

بریتی‌یە لە تەلیسکۆپێکی شکێنەرەوە ، ئەو ئامرازی بینایی‌یانەی «بصری ـ Optical» کە تیایدان بریتین لە شتێنەیەکی قۆقز Convex «پۆزیتیف ـ Positive» و چاوێنەیەکی رووچاڵ Concave «نەگەتیف ـ Negative» . وێنەیەکی رێکی «قیتی» تیادا پەیدا دەبێت ، ئەم جۆرە ئامرازەی کە بۆ یەکەم جار لەلایەن «گالیلۆ گالیلی» بۆ تێروانینی ئاسمان بەکار هێنراوە ، لە دوای ئەوەوە وازی لێ هێنراوە ، بەلام رژێمە بینایی‌یەکەی هێشتا هەر لە دووربینی ئۆپێرادا بەکار دێت ..

8 ـ **کامێرای شمیدت** Schmidt camera

**تەلیسکۆپی شمیدت** Schmidt tel

دەزگایەکە لەلایەن برنارد شمێدتی ئەڵمانی‌یەوە لە ساڵی 1926دا داهێنراوە ، بۆ چارەکردنی ئەو نەنگی ـ «کەمو کورپی‌یە» فیزیایی‌یانەی کە لە ئاوێنەکانی تەلیسکۆپدا دەردەکەون و کار دەکەنە سەر فلیمە فۆتۆگرافی‌یەکان ، بەم دەزگایە ، شمیدت توانی کە نایابترین وێنەی فۆتۆگرافی بۆ هەندێك لە تەنە ئاسمانی‌یەکان تۆمار بکات ، سێ دانە لەم دەزگایە لە روانگەی «پالۆمار»دا دروستکراوە ، گرنگترینیان تیرەی ئاوێنەکەی «72» ئینجەو تیرەی زەرەبینە راستکەرەوەکەی «48» ئینجەو ئەم زەرەبینە زۆر بە نرخە چونکە لە باشترین جۆری شووشە دروست دەکرێت .

9 ـ **تەلیسکۆپی ماکسوتۆف** Maksutov tel :ـ

شێوەیەکی دەستکاری کراوە لە کامێرای شمیدت ، لە لایەن بۆوەس 1940 ، ماکسوتوفی روسی‌یەوە ـ 1944دا هێنراوە ، لێرەدا لەوجە ناخرە Aspherical ـ «واتایەکێك لەرووەکانی خڕنیە» راستکەرەوەکەی ستوونی‌یە ، کامێراکەی شمیدت بە جۆرە زەرەبینێکی ئەوتۆ گۆڕراوەتەوە کە دیوێکی چاڵەو دیوەکەی تری قۆقزە ـ meniscus lens ـ و ئەستورایی‌یەکەی چوون یەکەو بە جۆرێکی ئەوتۆ نەخشەی بۆکێشراوە کە لێل رەنگی ـ «زیغ لونی ـ Chromatic aberration» تیادا روو نەدات «تێبینی ـ لە دواییدا باسی لێل رەنگی دەکەین» . ئەو پارچانەی کە لەم جۆرە میکرۆسکۆپەدا پەیوەندی‌یان بە بینایی‌یەوە هەیە ، بە شێوەیەکی ساکارتر دروستکراون وەك لە پارچەکانی کامێرای شمیدت و بۆری تەلیسك ,وپەکەشی کورتترە .

10 ـ **تەلیسکۆپی هێرشل** ـ Herschelian tel :ـ

لە ساڵی 1757دا بەر لەوەی کە چاوێلکە ساز «جۆن دۆلۆند» ئەو زەرەبینە شتێنە تازەی کە دروستی کردبوو ئاشکرای بکات ، لە شاری هانۆڤەرەوە لە ئەڵمانیا مۆزیقە ژەنێك ـ «موسیقار» ـ کە ناوی ولیم هیرشل بوو چوو بۆلەندەن .. هێرشل ماوەیەك لە لەندەن مایەوە ئنجا گواستی‌یەوە بۆ شاری «بات» و لەوێ بە چالاکی مۆسیقایی ناوبانگی دەرکرد ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هێرشل خوویەکی زۆری دایە زانیاری ئەستێرەوانی‌و بریاری‌دا کە تەلیسکۆپێك بۆ ئەم مەبەستە دروستبکات ، دوای سەدەها تاقی‌کردنەوەی سەرنەکەوتوو ، هێرشل توانی ئاوێنەیەکی تەلیسکۆپی روو چاڵی باش لە دارشتەیەکی ساف لە مس و تەنەکە ، نەوەك شووشە دروست بکات . دوای ئەم سەرکەوتنەی چەند ئاوێنەیەکی تری دروستکرد یەکێك لەوانە کە گەورەترین ئاوێنەی ئەو

سەردەمە بووە تیرەکەی «122» سانتی مەتر بووە ، ئنجا هێرشل ڕوانگەیەکی گەورەی لە شاری «سلۆ» لە ناوچەی «بیکینگهامشایەر» دامەزراند .

بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو هەروەکوو ئەستێرەوانەکانی تری پێش خۆی خێرابۆی دەرکەوت کە دامو دەزگای گەورە گیروگرفتی گەورەی بە دواوەیە .. لە بەر ئەوە دەستی‌کرد بە بەکارهێنانی تەلسکۆپێکی بچووك کە تیرەی ئاوێنەکەی تەنها «16.5» سانتیمەتربوو کە تەماشای‌کرد ئەمە باشترو ڕیکوپێك‌ترە ، هێرشل یەکێك لە هەرە دۆزینەوە گرنگەکانی خۆی لە مەیانی ئەستێرەوانیدا بە یەکێك لەم جۆرە تەلیسکۆپە هێناوەتە دی ، کە ئەویش دۆزینەوەی ئەستێرەی گەرۆکی حەوتەمە «یورانۆس» لە ساڵی 1781دا . لیرەدا «کارۆلینی» خوشکی زۆر بە دلسۆزی‌یەوە یارمەتی داوە لە شەوە سەختەکانی زستاندا بە دیاری‌یەوە دانیشتووەو مەرەکەبە بەستووەکەی بۆ گەرم کرووتەوەو تێبینی‌یەکانی بۆ تۆمار کردووە . جگە لەمە هێرشل لە ئەنجامی تێروانین ئەستێرەو تەمومژە ئاسمانی‌یەکاندا - «سدیم - Nebula» - گەلێك دۆزینەوەی گرنگی تری بەدی هێناوە ، دوای هێرشل چەند تەلیسکۆپێکی گەورەی تر دروست کروان ، بۆ نموونە دوو تەلیسکۆپە ڕەتکەرەوە مەزنەکانن :-

یەکەمیان تیرەی ئاوێنەکەی «508» سانتیمەترە لە ڕوانگەی «پالۆمار» لە کالیفۆرنیا ، ئەوی تریان تیرەی ئاوێنەکەی «6» مەترە ، لە یەکیەتی سۆڤێت دامەزرێنراوە .. ئێستا تەلیسکۆپێکی ڕەتکەرەوە ئاوێنە سەرەکی‌یەکەی لە شێوەی برگە هاوتا دایە بە شێوەیەکی لاری ئەوتۆ دانراوە کە تیشکی ڕووناکی بەرەو ئەو تیشکۆ سەرەکی‌یە ببات کە کەوتۆتە بەرامبەر جەمسەرە سەرەکی‌یەکەی بۆری‌یەکەو لەم جەمسەرەدا چاوێنەیەك هەیە ، هێرشل ئەم تەلیسکۆپەی بۆ کەم کردنەوەی بەفیرۆ چوونی ڕووناکی بەکار دەهێنا لەو ئاوێنە ناوەنجی‌یە کانزایی‌یەدا کە لە تەلیسکۆپە ڕەتکەرەوەکەی کاسیگرین و نیوتندا ڕووی دەدا ، بەلام ئێستاکە ئەم جۆرە تەلیسکۆپە بەکار ناهێنرێت .

**11 - دووربینە ڕابەرەکان «المناظير المرشدة» : Guide and finder**

بە زۆری دووربینی - تەلیسکۆپی» - ئەستێرەوانی دوو دووربینی ڕابەری بچووکی لەگەڵدایە ، یەکەمیان - Guide - دوو دووربینی شکێنەرەوەیە تیرەی زەرەبینەکەی لە دوو ئینج کەمتر نی‌یە لە ئاستی دووربینە سەرەکی‌یەکەدا دادەمەزرێنرێت بە جۆرێکی ئەوتۆ کە کایەی بینین تیایدا لەگەڵ هینی دووربینە سەرەکی‌یەکە بە شێوەیەکی تەریبی دەبەن و لەگەڵیدا لە کاتی وێنەگرتنی فۆتۆگرافیدا بەکار دەهێنرێن . بەلام دووربینی دووەم یارمەتی دەرە Finder تیرەکەی لە ئینچ و نیویك کەمتر نی‌یەو پێویستە هەر وەکوو ئەوی‌تر دابمەزرێنرێت ، ئەمەش یارمەتی سەیرکەرەکە دەدات بۆ دۆزینەوەو ئاسان کردنی تێروانینی تەنە ئاسمانی‌یەکان .

**12 - تەلیسکۆپی ڕادیۆیی = تەلیسکۆپی لاسلکی Radio tel**

نزیکەی «400» ساڵ دەبێت لەوەتی مرۆڤ تەلیسکۆپی بینایی «Optical tel» ، واتە ئەوەی کە بەکاری ڕووناکی ئیش دەکات ، بەکار دەهێنێت .. تەلیسکۆپی ڕادیۆیی دەزگایەکە لە ڕادارەوە داهێنراوەو لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەکار هێزاوەو دەرگایەکی تازەی لە زانیاری ئەستێرەوانی کردۆتەوە . ئەم دەزگایە بۆ مەبەستی ناسینەوە «دۆزینەوە»و وەرگرتن و تۆمار کردنی پەخش بوونەوەی لەرەلەری ڕادیۆیی لە تەنە ئاسمانی‌یەکان و بۆشایی ئاسمانەوە دادەمەزرێنرێت .

هەرچەندە کە ناونانی ئەم دەزگایە بە تەلیسکۆپ کارێکی ڕاست نیە ، چونکە فرمانەکەی بریتی‌یە تەنها لە تۆمارکردنی هێڵێکی شەپۆلدار لەسەر پارچە کاغەزێکی خولاوە .. ئەم دەزگایە لە ئێریەلێك «هەوایی»و چەند ئامرازێکی وەرگرو تۆمار کەر پێکهاتووە ، باوترین جۆری ئەم تەلیسکۆپە ، لەگەنی ساجی ڕادیۆیی‌یە Radio dish ئێریەلەکەی دوو پۆلی‌یەو «Dipole» درێژی‌یەکەی دەکاتە نیوەی درێژی شەپۆلی ئەو تیشکدانەوەیەی کە ئارەزووی وەرگرتنی دەکرێت و دەخرێتە تیشکۆی تەلیسکۆپێکی ڕەتکەرەوەی برگە هاوتای ئەوتۆوە کە لە تواناداا هەیە بۆ هەموو ناوچەیەکی تایبەتی ئاسمان ئاراستە بکرێت .. ئەو نیشانەیەی «Signal» کە لە ئاسمانەوە دێت لە لایەن ئێریەلەکەوە وەردەگیرێت و شی دەکرێتەوەو بۆ لەرەلەرێکی «تردد - Freq uency» نزمتر دەگۆڕێت و ئنجا گەورە دەکرێت پێش ئەوەی کە تۆمار بکرێت . هەندێك جۆری تری تەلیسکۆپی ڕادیۆیی هەیە ریزێك ئێریەل بەکار دەهێنێت و بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕێکخراون ئەوپەڕی لێکدانەوە بۆ ئەو نیشانەیە دەکەن کە وەر

دەگیرێت ، دەشێت ئێریەلەکان بە شێوەی ریزی تەریبی یان خاچی ـ «صلیبی» ـ یان هەر شێوەیەکی تر بەپێی ئارەزوو ڕێك بخرێن . بەم جۆرە تەلیسکۆپە چەند تەنێکی ئاسمانی دووری ئەوتۆ دۆزراونەتەوە کە لە توانای تەلیسکۆپە ئەستێرەوانی یە مەزنەکاندا نەبووە بیان دۆزنەوە ، ئێستاکە بەناوبانگترین تەلیسکۆپی رادیۆیی لە جیهاندا ئەوەیە کە لە ڕوانگەی «گرینبانك» لە خۆرئاوای ناوچەی «ڤەرجینیا» لە ئەمریکادا هەیە ، تیرەی لەگەنەکەی «300» پێیە .. هەروەها ئەو تەلیسکۆپە رادیۆیی یەی کە لە «جۆدریل بانك» لە بەریتانیادا هەیەو تیرەی لەگەنە ڕەتکەرەوەکەی «76» مەترە .

● **ڕوانگە «مرقب = مرصد Obeer vatory**

ڕوانگە بینایەکی مەزنە بە شێوەیەکی تایبەتی دروست دەکرێن ، چەند ئامرازێکی پێویستی تیادایە بۆ تێڕوانینی دیاردە سروشتی یەکان وەکوو ئەستێرەوانی جیو فیزیاو زانیاری بارەکانی کەش و بومەلەرزە پێویستە شوێنی بیناکردنی ڕوانگە زۆر بە ووردی و ئاگاداری یەوە هەڵبژێررێت ، بۆ مەبەستی تێڕوانینی تیشکی ژێر سور «تحت الحمراء ـ infra red rays» و بینایی «بصري ـ Optical» پێویستە ئەو ڕوانگەیە دووربێت لە شارەکانەوە ، چونکە شارەکان هەندێك گیروگرفتیان هەیە وەکوو شیانی پیس بوونی ـ «تلوث» ـ کەش و شەوق دانەوەی گڵۆپی شەقامەکان ، چونکە ئەمانە ناهێڵن تێڕوانینەکە بە شێوەیەکی باش بێتە دی .. باشترین شوێن بۆ مەبەستی تێڕوانین چیاکان یان و دەشتە بەرزەکانن .

تەنانەت لەم شوێنانەشدا پێویستە بارەکانی کەش ڕەچاو بکرێن ، چونکە پێویستە ئەو شوێنە ژمارەیەکی باش لە شەوانی سایەقە «بێ هەور یان کەم هەور» تیادا ڕوو بدات بۆ مەبەستی تێڕوانین بۆیە دەبینین کە ڕوانگە گەورەکان لە باشووری ئەفەریقاو ئوستەرالیاو شیلی و قەراخی خۆر ئاوای ئەمریکادا دامەزرێنراوان ، ئەو تەلیسکۆپانەی کە بۆ تێڕوانینی تیشکی ژێر سوورو بینایی تەرخان دەکرێن ، پێویستە لە بینای گومەزداردا دابمەزرێنرێن ، گومەزە نیوە نیوە گۆیی یەکەی ـ قابیلی خولانەوەیەو درزی تایبەتی تیادایە کە بەدەرگای خلیسك دادەخرێت لە کاتی ئیش کردندا ، لەم درزانەوە تێڕوانین جێبەجێ دەکرێت ، جگە لەمە دەبێت تاقیگەو ژووری تاریکی وێنەگرتن و وەرشەی هەموو پێویستی یەکی ژیانی تیادا ئامادە بکرێت بۆ خۆش گوزەرانی فەرمانبەرو کرێکارانی ئەو ڕوانگەیە .

زیاتر لە «200» ڕوانگەی پیشەیی لە ناوچەکانی جیهاندا هەن ، لە ساڵی 1945 وە دوا بەدوای گەشە کردنی رادار لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا ، گەلێك ڕوانگەی رادیۆیی هاتۆتە ئاراوە ، چۆنێتی هەڵبژاردنی شوێنی ڕوانگەی رادیۆیی ئەوەندە گرنگ نی یە لەچاو شوێنی ڕوانگە بینایی یەکاندا ، چونکە بارەکانی کەش وەکوو هەوروشتی تر زۆر کار ناکەنە سەر پێوانە رادیۆیی یەکان .

تەلیسکۆپی رادیۆیی لە ریزێك لە ئێریەل ـ «هەوایی» ـ پێکدێت ، بە پێی ڕووبەری شوێنی دامەزراندنەکەی .

کەوابوو لێرەدا مەبەست لە بیناکردنی ڕوانگەو دامەزراندنی تەلیسکۆپی گەورە لەسەر لوتکەی چیاکان هەر ئەوەنیە کە ببن بە شوێنێك بۆ مرۆڤ و داموو دەزگاو ئامراز بۆ مەبەستی تێبینی کردنی مانگ و ئەستێرەکان ، چونکە ئەم ئیشە لە لایەن تەلیسکۆپە بچووکەکانیشەوە دەکرێت ، بەڵام ئەگەر هەوا وەستاوبێت ، کە ئەمە بەدەگەن ڕوو دەدات تەلیسکۆپە گەورەکان دەتوانن تەنانەت تەنە ووردەکانی سەرمانگ و ئەستێرەکانیش ببینن ، چونکە ئەم تەلیسکۆپە گەورانە هێزی دەرخستن و بینینیان مەزنترە .. زەڕەبین یان ئاوێنەی گەورە لە تەلیسکۆپدا توانای کۆکردنەوەی بڕێکی گەورەتریان هەیە لە ڕووناکی هەر وەکوو چۆنە سەربانی خانوویەك بڕێکی زیاتر لە ئاوی باران کۆدەکاتەوە وەك لە دۆڵکەیەك ، بۆ نموونە ئاوێنەکەی تەلیسکۆپی چیای «پالۆمار» کە تیرەکەی لە پێنج مەتر زیاترە ، زیاتر لە ملیۆنێك ئەوەندەی چاوی مرۆڤ ڕووناکی کۆدەکاتەوە ، چونکە ڕووبەرەکەی ملیۆنێك جار لە ڕووبەری هەردوو چاوی مرۆڤ زیاترە ، ئەمەش مانای ئەوەیە یارمەتی سەیرکەرەکە دەدات کە بتوانێت ئەو ئەستێرە کزانەش ببینێت کە بەهیچ جۆرێك بە چاوی ڕووت ـ «بەبێ دووربین» ـ نابینرێن .. ئەم جۆرە ئاوێنەیە ئەستێرەو ڕێگەی کاکێشانی ـ «مجرة Galaxy» ـ وامان بۆ دەردەخات لە مەیانەکانی بۆشایی ئاسماندا ، کە ڕووناکی یەکەیان بە چەندەها ملیۆن ساڵی ڕووناکی دەگاتە ئێمە ، ساڵی ڕووناکی ـ «Light year ، سنه ضوئية» ـ بریتیە لە «یەکەی نێوانی دووری لە ئاسمانداو دەکاتە ئەو ماوە دووری یەی کە ڕووناکی لە ماوەی ساڵێکدا

دەیبڕێت» .

ئەوەی شایانی باسە ، زاناکانی ئەستێرەوانی ئەم سەردەمە زۆر کەم لە پشت تەلیسکۆپەکانیانەوە دادەنیشن بۆ تێڕوانینی تەنە ئاسمانی یەکان ، چونکە ئێستاکە لە جیاتی چاو فلیمی فۆتوگرافی بەکار دەهێنرێت بۆ وێنە گرتنی تەنە ئاسمانی یەکان ، جاران ئەستێرەوانە کۆنەکان بەدەست نەخشەی ئەو شتانەیان دەکێشا کە لە ئاسماندا دەیان بینین ، ئاشکرایە کە ئەم جۆرە نەخشانەش زۆر ووردو ڕێکوپێك نەدەبوون و جگە لەوەی کە هەندێك جار چاوی ڕووت بە هەڵەدا دەچێت ، بە تایبەتی هەندێك جار هەندێك ئەستێرە بە ڕواڵەت زۆر بچووك دیارن ، بەلام لە ڕاستیدا بچووك نین ، بەلام ڕووناکی یەکەیان کزە .

## لێڵ ڕەنگی «زیغ لوني» : Chromatic aberration

## لێڵ گۆیی «زیغ کروی» : Spherical aberration

زەرەبین تەنها بەوەی کەوا شێوەیەکی خڕی هەیە ناتوانێت هەموو شەپۆلەکانی ڕووناکی لەیەك تیشکۆدا ، وەکوو پێویستە کۆبکاتەوە ، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان درێژی یەکانی شەپۆلەکانی ڕووناکی لە لایەکەوەو جیاوازی ئەستووریی زەرەبینەکە لە لایەکی ترەوە . ئەمەش دەبێتە هۆی جیاوازی یەك لە شکاندنەوەی شەپۆلەکانی ئەو ڕووناکی یەی کە پیایدا گوزەر دەکات ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدا بوونی هەندێك ناڕێکی و ڕەنگی ڕووناکی درۆزنە لە وێنەی تەنە بینراوەکاندا ، ئەم دیاردەیەش پێی دەووترێت لێڵ ڕەنگی و لێڵ گۆیی ، لە دواییدا مرۆڤ بۆی دەرکەوت کە دەشێت کەموکوڕیی زەرەبینێك هیچ نەبێت هەتا ڕادەیەك کەمو کوڕیی زەرەبینێکی تر ڕاست بکاتەوە . لە ساڵی 1730دا زانایەکی ئینگلیزی کە ناوی «تشسترمورهول» بوو ، ئەوەی دۆزی یەوە کە دەشێت دیاردەی لێڵ ڕەنگی بە زەرەبینێکی دوو پارچە کە هەریەکە لە جۆرە شووشەیەك دروست کرابێت ، چارەسەر بکرێت .. ئەم دوو جۆرە شووشەیە یەکێکیان پێی دەووترێت شووشەی تاجی ئەوی تریان شووشەی ئەستێ «هوائی» ، بەلام وا دیارە لەو کاتەدا کەس نەبووە گوێ بداتە ئەم دۆزینەوەیە . بەلام دوای ئەمە بە چارەکە سەدەیەك چاوێلکە ساز «جۆن دۆلۆند» بلاوی کردەوە کەوا توانیویەتی زەرەبینێکی شتێنەی بێ ڕەنگی ـ «ئەکرۆماتی» ـ واتا «عدسة لالونية achromatic lens» دروست بکات ، ئنجا لاوی ئەڵمانی جوزیف فرانهۆفەر ، لە ساڵی 1825دا دەستی کرد بە چاك کردن و گەشەپێدانی ئەم داهێنانە لە تەلیسکۆپە شکێنەرەوەکەیدا کە تیرەی زەرەبینە شتێنەکەی «24» سانتیمەتر بووەو لە چاکیدا لە هەموو تەلیسکۆپەکانی ئەو سەردەمە باشتربووە ، دوای ئەوە دۆزراوەتەوە کە دەشێت بە بەکارهێنانی زەرەبینێکی سێهەم کە لە سێ جۆری جیاواز لە شووشە دروست کرابێت ، چاككردن و گەشە پێدانێکی بۆ دەست بکەوێت ، بەم جۆرە زەرەبینانە دەووترێت زەرەبینە بینایی یە فۆتۆگرافی یەکان ، چونکە بۆ تێڕوانینی بینایی یانە یان بۆ وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بەکار دێن .

هەروەها هەندێك چاككردن و دەستکاری کردنی تریش هەیە کە لە زەرەبیندا دەکرێن وەکوو ئەوەی کە زەرەبینەکە بە ڕووکەشێکی تەنگ دابپۆشرێت بە جۆرێکی ئەوتۆ کە وەکوو شەوقدانەوەیەکی شین یان ئەرخەوانی ببینرێت . ئەم ڕووکەشە «بۆیەیە» ماوە دەدات بە تێپەڕبوونی بڕێکی زۆرتر لە ڕووناکی بە زەرەبینەکەدا ، چونکە لەبری ئەو تیشکی ڕووناکی یە کەم دەکاتەوە کە لە ئەنجامی ڕەت بوونەوەوە وون دەبێت .. بە داهێنانی زەرەبینی ئەکرۆماتی ـ «بێ ڕەنگی» ـ بەربەرەکانێ یەکی زۆر لە نێوانی بەکار هێنانی زەرەبینی شتێنەو ئاوێنەدا لە دروست کردنی تەلیسکۆپدا پەیدا بوو ، هەرچەندە کە هەریەکەیان لایەنگیری خۆی هەیە .

## ● سەرچاوەکانی ئەم ووتارە :

1 ـ الموسوعة الفلكية المبسطة ـ ميخائيل عبدالاحد ـ طبع على نفقة مؤسسة البحث العلمي سنة 1977 .
2 ـ كيف يعمل المرقب «ألتلسكوب» والمجهر «الميكرسكوب» تأليف ـ روىورفيل ـ نقله الى العربية ـ احمد شفيق الخطيب ، طبع في انكلترة سنة 1977 .

3 — ADictionary of ASTRONOMY

Dr. Robert Maddison,

The Hamlyn Poblishing Group limited 1980

4 — Hamlyn all — Colour paper backs Astronomy Lain Nicolson .

نووسینی: رۆمان نووسی بەناوبانگ
فلادیمیر بولیاکۆف

شانۆنامەیەکە لەیەك پەردەدا

# ئاگر کوژێنەرەوە

«ژووری سەرنووسەری رۆژنامەیەك، کچێکی تازە نووسەر لەوانەی هێشتا لە سەرەتای پیشەی رۆژنامە نوسیدان بە شەرمەوە دێتە ژوورەوە».

**کچەکە**: ببوورە... شەرمەزارم... بێ پرس هاتم.. جەنابتان سەرنووسەری ئەم رۆژنامەیەن.

**رۆژنامەنووس**: بەڵێ.

**کچەکە**: من ناوم «کرابیفینا» یە چیرۆکێکم نووسیوە، ویستم لە رۆژنامەکەتانا بلاوی بکەمەوە.

**رۆژنامە نووس**: بۆم ناخوێنیتەوە؟

**کچەکە**: ناونیشانی چیرۆکەکەم «کارێکی جوامێرانە» یە...

«دەست بە خوێندنەوەی دەکات»

کات سەعات سێ ی پاش نیوە شەوبوو، خەڵکی شارەکە هەموویان لە شیرین خەوابوون، تاریکی و بێدەنگی خێوەتیان بەسەر هەموو لایەکدا هەڵدابوو، نە چرایەك ئەسووتا، نە جوولەیەك هەبوو دڕ بەو بێدەنگیەیدا... لە ناکاوا لە پەنجەرەی ژوورێکی نهۆمی چوارەمی ئاپارتمانێکا گڕی ئاگر لرفەی ئەکرد... ئاگرێ بوو بێ ئامان گڕە سوورەکەی ئەتوت خوێنی ئادەمزادە، دەنگی پیاوێ لەو کاتەدا بەرز بووەوە هاواری ئەکرد «بمان گەنێ... فریامان کەون... سووتاین»، ئەو دەنگە، دەنگی کابرایەکی کرێ گرتەی کەمتەرخەم بوو، شەوێ پێش نووستن زۆپا کارەباییەکەی نەکوژاندبووەوە... لە ئەنجامیشدا ئەو کارە رەهاتەی نایەوە... دەنگی ئاگر کوژێنەوە لە دوورەوە ئەبیسترا کە نزیك بووەوە پیاوەکانی دابەزین و بە پەیژە پۆڵاییەکانیانا هەڵزنان ئەو ژوورەی کابرا هاواری لێوە ئەکرد بووبوو بە مقەڵی یەکی پڕ لە پشکۆی سوور کوڕێکی لاوی سمێڵ رەشی اوکرانییان تێدابوو، خۆی ڕانەگرت، بە پڕ تاو خۆی بەناو گڕی ئاگرەکەدا کرد، کابرای خاوەن ژوورە سووتاوەکەی بەسەر شانیا داو لە مردن رزگاری کرد، ئەمجا لوولەی سۆندە گەورەکەی کردە ژوورەکەو توانی ئاگرەکە بکوژێنێتەوە.. سەرکردەی ئاگر کوژێنەرەوەکان دە ستێکی بە شانیا داو پێ ی ووت:

«بەراستی مەردی، پێویستی سەرشانت پیاوانە بەجێ هێنا بەلام سەیرێکی سمێڵت لەو ئاوێنەیەدا بکە دەبینی لایەکی خەریکە ئەسووتێ، بێ ئەوەی بەخۆت بزانی».

کوڕە لاوەکە بەزەردەخەنەوە لوولەی سۆندەکەی کردە سەر سمێڵی لەو کاتەدا رۆژلە ئاسۆوە بەرە بەرە تیشکی پەخش ئەکرد»

**رۆژنامەنووس**: بەراستی چیرۆکەکەت خراپ نییە، ناونیشانەکەشی بەجێیە، بەلام هەندێ رستەی تیایە پێویستی یان بە بژار هەیە بەبێ ئەرك سەرەتاکەیم جارێکی کە بۆ بخوێنەرەوە.

**کچەکە**: «کات سەعات سێ ی پاش نیوەشەو بوو، خەڵکی شارەکە هەموویان لە شیرین خەوا بوون، تاریکی و بێدەنگی خێوەتیان بەسەر هەموو لایەکدا هەڵدابوو...

**رۆژنامە نووس**: سەرەتایەکی زۆر خراپە بۆ چیرۆك، چونکە ئەمە وا ئەگەیەنێ کە تەنانەت پاسەوانەکان پۆلیسەکانیش لەو دەمەدا خەوتوون... ئایا ئەمە شتێکی نارەوا نییە کە ئەوانە ئا لەو کاتەدا لە شیرین خەوابن؟ ئەبوایە چیرۆکەکەت ئاوا دەست پێ بکردایە «کات سەعات سێ ی پاش نیوە شەو بوو کەس لە خەڵکی شارەکە نەنوستبوو...»

**کچەکە**: بەلام ئەمە شیاو نییە، چونکە خەڵکی بەشەو ئەنوون.

**رۆژنامە نووس**: ئەوەی تۆش راستە کەواتە بنووسە «بەشێ لە خەڵکی شارەکە نوستبوون و بەشێکیشیان بە ئاگا بوون» فەرموو چیرۆکەکەت بخوێنەرەوە.

**کچەکە**: «لە ناکاوا لە پەنجەرەی ژوورێکی نهۆمی چوارەمی ئاپارتمانێکا گڕی ئاگر لرفەی ئەکرد... ئاگرێ بوو بێ ئامان، گڕە سوورەکەی ئەتوت خوێنی ئادەمزادە، دەنگی پیاوێ لەو کاتەدا بەرز بووەوە هاواری ئەکرد «بمان گەنێ... فریامان کەون... سووتاین!»

**رۆژنامە نووس**: پێم وابێ ئەم کارە ترسناکە پێویست نەبێ، وانییە؟

**کچەکە**: بەڵێ

**رۆژنامە نووس**: رەنگە تۆ وابزانی رۆژنامە بۆیە دەر ئەچێ تا هەواڵی ترسناك بەگوێ ی خەڵکیدا بداو لەرز بخاتە دڵیانەوە،

ئەگەر من لەجێی تۆ بوومایە لە بریتی ئەوەی بڵێم «بمان گەنێ... فریامان کەون.. سووتاین!» رستەیەکی قووڵتری وام ئەنووسی کە هەستی بەزەیی پیا هاتنەوەی تیا بوایە.

**کچەکە**:... وەکووچی؟

**رۆژنامە نووس**: باشە، چاکە.. بە مانا.. بڵێ: «یەکێ لە چاوەکان.

**هاواری کرد**: **هیچ نییە.. یەکێ هەر ئەبێ، ئەم ئاگرە بکوژێنێتەوە!» فەرموو بەردەوام بە.**

**کچەکە**: ئەو دەنگە، دەنگی کابرایەکی کرێ گرتەی کەمتەرخەم بوو، شەوێ پێش نووستن زۆپا کارەباییەکەی نەکوژاندبووەوە»

**رۆژنامە نووس**: ووتت چی؟ کرێ گرتە...

**کچەکە**: «کرێ گرتەیەکی کەمتەرخەم»

**رۆژنامە نووس**: تۆ کەمتەرخەمی و تەمەڵی تێکەڵ ئەکەی، ئەمەش بەلای منەوە، مەسەلەیەکی پڕ ترسییە. چونکە نابێ ئێمە خوێنەر لەسەر ئەم جۆرە ووشەو زاراوانە پەروەردە بکەین.

**کچەکە**: من کە ئەم رووداوە ئەنووسم مەبەسم پەروەردەکردنی خوێنەر نییە... بەلام ئاخۆ تۆ لەو بروایەدا نیت ئەگەر زۆپا کارەباییەکە لە چیرۆکەکە هەڵبگرین ئیتر لەتوانادا نییە ئەو ئاگرە بەر بێتە ژوورەکە.

**رۆژنامە نووس**: جا تۆ خەم بۆ ئەوە ئەخۆی کە ئاگرەکە ناکەوێتەوە؟

**کچەکە**: نەخێر... من...

**رۆژنامە نووس**: زۆپا کارەباییەکە لە چیرۆکەکەت هەڵبگرە بەو شێوەیە ئەتوانی بەسەر ئاگر بەربوونەکەدا تێپەڕی و راستەو خۆ بچیتە سەر لاوە ئاگر کوژێنەرەوەکە.

**کچەکە**: ئەشتوانم بڵێم «کورە لاوە سمێڵ رەشە اوکرانییاییەکە لەناو دەرگاکەدا راوەستابوو کەوتبوە دەریای بیرکردنەوەوە ئەمجا بە پڕ تاو خۆی بەناو گڕی ئاگرەکەدا کرد.

**رۆژنامە نووس**: ئەمەیان هەر زۆر خراپە، ئاگر کوژێنیەوەو بیرکردنەوە یەك ناگرن.

**کچەکە**: بەلام هیمایەکە ئاستی چیرۆکەکە بەرز ئەکاتەوە.

**رۆژنامە نووس**: بەڵێ، ئاستی چیرۆکەکەت بەرز ئەکاتەوە نەك ئاگر کوژێنەرەوەکە.

**کچەکە**: ئەی چۆن لەگەڵ سەرکردەکەیا بدوێ؟ چۆنیان بهێنمە قسە؟

**رۆژنامە نووس**: با کە دەگەڕێنەوە بۆ مەڵبەندەکەیان لەوێ بکەونە گفتوگۆ... ئەرێ چییان ئەووت؟

**کچەکە**: سەرکردەی ئاگر کوژێنەرەوەکان دەستێکی بەسەر.

**شانیداو پێی ووت**: «بەراستی مەردی، پێویستی سەرشانت پیاوانە بەجێ هێنا، بەلام سەیرێکی سمێڵت لەو ئاوێنەیەدا بکە دەبینی لایەکی خەریکە ئەسووتێ، بێ ئەوەی بەخۆت بزانی، کوڕ لاوەکە بە زەردەخەنەوە لوولەی سۆندەکەی کردە سەر سمێڵی، لەو کاتەدا رۆژ لە ئاسۆوە بەرە بەرە تیشکی پەخش ئەکرد.»

**رۆژنامە نووس**: بەلام پێم نالێی تۆ پێویستیت بەو سمێڵە سووتاوە چییە؟

**کچەکە**: مەبەسم ئەوەیە چیرۆکەکەم هەر تراژیدیا نەبێ پێکەنینیشی تێدا بێ.

**رۆژنامە نووس**: لای بە.. ئەوەش لابە.. ئەمجا لەبەر رۆشنایی ئەم ئامۆژگاریانەی من چیرۆکەکەتم لەبەرگە نوێکەیدا بۆ بخوێنەرەوە.

**کچەکە**: «دەست بە خوێندنەوە دەکات» (کاریکی جوامیرانە)...

«کات سەعات سێی پاش نیوە شەو بوو، بەشێ لە خەڵکی شارەکە نوستبوون و بەشێکیشیان بە ئاگابوون، لەناکاوا لە پەنجەرەی ژوورێکی نهۆمی چوارەمی ئاپارتمانێکا دەنگێ بیسترا ئەیوت «هیچ نییە یەکێك هەر ئەبێ ئەم ئاگرە بکوژێنێتەوە» سەرکردەی ئاگر کوژێنەرەوەکان وتی: «ئەی لاوە ئوکرانیاییە سمێڵ رەش، بەراستی مەردی، پێویستی سەرشانت پیاوانە بەجێ هێنا، لاوەکە بە زەردەخەنەوە رووی لوولەی سۆندەکەی کردە سمێڵی. بەرە

لەو کاتەدا رۆژ لە ئاسۆوە بەرە تیشکی پەخش ئەکرد»

**رۆژنامە نووس**: بینیت...؟ بۆت دەرکەوت ئێستا چۆن بوە چیرۆکێکی سەرکەوتوو! ئەمجا ئێستا لە توانادایە بلاوبکرێتەوە.

---

**تێبینی**: ئەم شانۆ نامەیە لەگەڵ (16) شانۆ نامەی ترا سەمیر شێخانی گۆڕیویەتە سەر زمانی عەرەبی و لەبەرگێکدا بە ناوی (سهرة پوکر) لە ـ دار السمیر ـ لە بیروت چاپکراوە..

# پێکەنینی بەڕێزەکەی یاسا

نووسینی : حسین عارف

**[ دیمەنی یەکەم ]**

• لە ناوەڕاستی سەر شانۆدا تابووتێك لە بابەتی زۆر کۆن و لەوانەی شیاوی یەکێك لە پادشاکانی زەمانی دێرین بێ دانراوە . زاناو دوو پاریدەدەری بە دیاری یەوە ڕاوەستاون . لە گەڵ لادانی پەردەدا زانا دێتە پێش دەمی شانۆو ڕووی قسە لە دانیشتووان دەکا ) .

**زانا** : گەورەکانم .. پێش هەموو شتێك دەمەوێ خۆم و ئەم دوو زاتەتان پێ بناسێنم . من خۆم وەك مێژوو ناسم ، زانـایەکی پشکنینی شوێنەواری کۆنیشم کە ئەوی ڕاستی بێ ، پیشەی مێژووناسی یەکە خستمی یە سەر ئەم ڕێگایەو ئیتر ئەوە زیاد لە بیست ساڵە ، من چنگ و پـەلم لە گڵ و خـۆڵی کـە لاوەو دارو پەردووی شوێنەوارە کۆنەکاندایە . لەو وەختەوە وێڵم بە دوای کۆزە شکاوێکدا ، یا پارچە مسێکی ژەنگ گرتوو ، یا پەیکەرێکی سەرو گوێلاك شکاو ، یا هەر شتێکی تردا کە جـۆری کردارو ڕەفتارو چالاکی ی باووباپیران بخاتە ڕوو . بەهەر حاڵ زۆر شتم دۆزی یەوەو لە ڕێگەی ئەو شتانـەوە ، شارەزایی یـەکی زۆرم دەربارەی ماکی مێژوو پەیدا کرد .. زۆر زۆر زیاتر لەوەی کە لەوەبەر وەك مێژووناسێکی ئاکادیمی دەمزانی .

بەلام گەورەکانم .. ئەوەی کە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە ژێر دارو پەردووی کەلاوە کۆنێکداو لە قووڵایی ی بیست پێدا دۆزیمەوەو دوای مشت و مڕێکی زۆر لە گەڵ ئەم دوو زاتەدا ـ لێرەدا ئەوانیشتـان پێدەنـاسێنم و دەڵێم : دوو پاریـدەدەری کارامەو لێهاتوومن و ئەوانیش لە دەمێکەوە کەوتوونەتە داوی خۆشەویستی ی ئەم ئیشەوە ـ ئـا .. دوای مشت و مڕێکی زۆر بڕیارمدا ئێوە داوەت بکەم بۆ ناو ئەم هۆڵەو ئەوەی لە ئێمە چوو بووە کۆڵی شێرو سەرمان بۆ لێدەرنەکرا ، یا بـا بڵێین تیـایدا نەگەیشتینە ئەنجـام ، بە ئێـوەی ڕابگەیـەنین ، بـەو نیازەی پاریدەمان بدەن و لە گەڵماندا ....

**پاریدەدەر ـ 1 ـ** : **(قسە بە زانا دەبڕێ ) من ئێستەش هەر سوورم لە سەر ڕای خۆم و دەڵێم نەء .**

**پاریدەدەر ـ 2 ـ** : منیش .. ئا منیش هەر لە سەر ئەو ڕایەم .

**زانا** : ڕاوەستن .. سەبر بگرن .. با قسەکەمیان بۆ تەواو بکەم .

**پاریدەدەر ـ 1 ـ** : دوکتۆر .. ئاخر هەر لە بنەڕەتەوە پێویستی نەدەکرد تۆ ئەو عەزێتی هاتنە بخەیتە بەر ئەم بەڕێزانە .

**زانا** : بەلام ...

**پـاریدەدەر ـ 2 ـ** : **دوکتـۆر .. تۆ خـۆت دەزانیت ئێمـە چەندە ڕێـزی تۆو قسـەی تۆبیـروڕای تۆمـان دەگرت و دەزانیت تا ئێستاش بەرامبەرت هـەروەهاین . بـەلام بۆ ئەمەیان ..**

**زانا** : ئێ ئەی بۆ ئەمەشیان ڕێك نەکەوتین .. کە ...

**پاریدەدەر ـ 2 ـ** : بارێك کەوتین .. بەلام من ..

**یاریدەدەر — 1 —** : بەلام هەردووکمان دوای بریارەکە زۆرمان بیر لە مەسەلەکە کردەوەو وامان بە چاك زانی کە تۆ ...
**سەیرکەر — 1 —** : ( لە ناو هۆلەکەوە ) ئەرێ ئێمە هاتووین گوێ لە مەتەل بگرین و بە تەمسیل مەتەلمان
**نیشان** بدرێ یان چی ؟! . ئەوە ئێوە لە چی دەدوێن ؟!.
**سەیرکەر — 2 —** : ئەی دەم خۆش .. ئەشەدو بیلا راست دەکا .. خۆ منیش لە لای خۆمەوە لەوەدابووم ئەو پرسیارەتان لێ بکەم .
**سەیرکەر — 3 —** : دوکتۆر گیان .. لە قسەی ئەم دوو برادەرە زویر مەبە . لەوە دەچێ نەتناسن . من دەتناسم و زۆرت رێز لێدەنێم . مەبەستم شەخسی خۆت نییە . یەکەمجارە شەخسی خۆت دەبینم . مەبەستم نووسینەکان و کوششی بەردەوامتە لە کۆری ئێشەکەتدا . بەلام تکایە تێمان بگەیەنە مەسەلە چی یە ؟!.
**سەیرکەر — 2 —** : ئائا .. ئا ئەمەیان گرنگە .
**سەیرکەر — 1 —** : زۆر راستە .. تێماندەگەیەنن یا بڕۆین ؟!.
**زانا** : ( رەق راوەستاوە . دەستی ناوەتە بەر پشتێن . بێدەنگ گوێ لە قسەکان دەگرێ و دەخنێتەوە )
**سەیرکەر — 4 —** : دەلێی پێمان رادەبوێرێ !.
**سەیرکەر — 5 —** : ئەرێ وەللا پێمان رادەبوێرێ . گوایە ئێمە گالتەچی ئەوین ؟!. من بەش بە حالی خۆم رازی نابم و دەرۆم .
**سەیرکەر — 4,2,1 —** : ئێمەش دەرۆین .
**زانا** : ( دەکەوێتە خۆی ) گەورەکانم .. براکانم .. دلسۆزانم .. مەرۆن .. تکایە مەرۆن و گوێم لێبگرن . وا بۆتانی تەواو دەکەم . وا بۆتانی باس دەکەم و لە کورتی دەیبرمەوە .
**سەیرکەران** : ( دادەنیشنەوە )
**زانا** : گەورەکانم .. ئەوەی لە قوولایی بیست پێداو لە کەلاوەیەکدا دۆزیمەوە ، گۆرێك بوو کە توندو تۆل بە مەرمەر هەلبەسترابوو . بۆ ماوەی دوو رۆژی رەبەق لە گەل ئەم دوو زاتەدا بە دیوی دەرەوەیدا لێی وردبووینەوەو بیرمان لێکردەوە ، بێ ئەوەی هیچ شتێکی ئەوتۆی پێوە ببینین سەرنجمان رابکێشێ ، تەنیا هێندە نەبێ کە بەدارو پەردووەکەی دەورو پشتیدا بۆمان دەرکەوت گۆرەکە لە ناو ژوورێکی ژێر زەمینی بێ دەرگادا بووە . ئەوسا بریارمدا گۆرەکە هەلبدەمەوە . لە ناویدا گۆرێکی هەلبەستراوی توندو تۆلتر بوو . کە چاك لەویشیان وردبوومەوە ، نووسینێکم بەرچاو کەوت کە لە سەر هەموو لایەکانی دووپات کرابووەوە . خوێندنەوەی بۆ من وەك ئاوخواردنەوە وەها بوو . تەنیا نوسرابوو « ئاگاداربە » . ئاگادار بووم . بەردە مەرمەرم لە سەرخۆ لێلادان . ئەم تابووتی حازرییەم لێدەرکەوت . ( دەچێ بەلایەوە ) . ئەم تابووتە تابووتێکی ئاسایی نییە . خۆ وەنەبێ من باوەرم بە قسەی پروپووچی لە بابەتی لەعنەتی فیرعەونییەکان هەبێ . بەلام نازانم بۆچی شتێك لە ناخەوە .. بانگەوازێك لە ناخی ناخەوە پێم دەلێ کە سەرهەلدانەوەی ئەم تابووتە ، ئەگەرچی بە ژماردە ژماردوومەو (124) جار لە سەری نوسراوە ـ نەکەی سەرم هەلبدەیتەوە ـ بەلام سەرهەلدانەوەی وەك دەوترێ زەمین ژێرەوزەبەر دەکا . من نازانم ئاخۆ بەرەو هەلسانی جەجال یا بەرەو هاتنی مەهدی دەیکا !. من تەنیا هێندە دەزانم کە ژێرەوزەبەری دەکا .

**سەیرکەر — 1 —** : ئێ جا چیت لە ئێمە دەوێ ؟.. ئێمەت بۆچی بانگ کردوە بۆ ئێرە ؟!.
**زانا** : سوپاست دەکەم .. بۆ بریار لەسەردان . ئایا سەری تابووتەکە هەلبدەینەوە یان نا ؟!.
**یاریدەدەر — 1 —** : نەء .
**= — 2 —** : نەخێر .
**زانا** : گوێتان لێیە .. ئەوان دەلێن نەء و من دەلێم ئا .. ئەی ئێوە دەلێن چی ؟!. لە بیریشتان نەچێ .. من گەرەنتی نادەم !. من تەنیا کۆششێکەو بە ئەقلی خۆمی دەکەم .
**سەیرکەر — 1 —** : ئا ...
**سەیرکەر — 5,4,3,2 —** : ئا .. بەلێ .. ئا ... ئا ؟!
**سەیرکەران** : ( لە گەل ژمارەیەکی تریشدا ) ئا .. ئا ...
**زانا** : ( دەچێ بە لای تابووتەکەوە ) .
**یاریدەدەرەکان** : ( **بە ناچاری دەچن بۆ یاریدەدانی** )
**سێ قۆلی** : ( سەری تابووت لادەدەن )
**پادشا** : ( لە ناو تابووتەکەوە بە دەستووری مردوویەك و زیندوو ببێتەوە ، سەر بەرز دەکاتەوە . جلو بەرگی پادشایی یەکێ لە مەملەکەتە کۆنەکانی لە بەردایە . دەروانێتە ئەم لاو ئەولای خۆی . زاناو یاریدەدەرەکانی بەدی دەکا .
**زانا / یاریدەدەرانی** : ـ( سل دەکەنەوە . دەکشێنە دواوە )

**پادشا** : ( هەڵدەستێتە سەرپێ . جارێکی تر دەڕوانێتە دەوروپشتی . لە تابووتەکە دێتە دەرەوە . رووەو ئەوان رادەوەستێ و سەرنجیان دەداتێ . لەناکاو بە دەنگی بەرز بانگ دەکا ) شارات ...

**زانا / یاریدەدەرانی** : - ( سڵ دەکەنەوە . زیاتر دەکشێنەوە )

**پادشا** : ( روو بۆ لای چەپی شانۆ وەردەگێڕێ ) شارات .. شارات .. لە کوێیت ؟

**یاریدەدەران** : ( هەڵدێن . سەر شانۆ جێ دێڵن ) .

**پادشا** : کوڕە شارات .. بۆ وەرام نادەیتەوە ؟

**زانا** : ( ئەویش هەڵدێ و سەر شانۆ جێ دێڵێ )

**تابووت** : ( رادەکێشرێتە پشتەوەی سەر شانۆ )

**شارات** : ( کلیلداری کۆشکی پادشایە . لە لای چەپەوە بە هەڵەداوان دێتە سەر شانۆ ) بەڵێ .. بەڵێ پادشای خۆشی و شادمانی .. بەڵێ فەرموو سەرم لە رێتە .

**پادشا** : ( بە دەم پێکەنینێکی دروستکراوەوە ) کوڕەکەم .. سەمەرەترین شت بۆ هەر پادشایەك ئەوەیە فەرمانی بەجێ نەهێنرێ . تۆ خۆت دەزانیت کە پادشاو فەرمان کردنیان وتەوو فەرمانیشی دەبێ بەجێ بهێنرێ . دەنا پادشای چی یە ؟!.

**شارات** : ( بە روو یەکی گەشەوە ) ببوورە پادشای بەختیاری و شادمانی . ببوورە .. فەرمایشتت لە سەر سەرەو بەجێیە . بەڵام تکایە لوتف بفەرموو بۆمی باس بکە .. چی رووی داوە ؟!.

**پادشا** : کوڕەکەم .. من کە ئەو یاسا نەمرەم دانا ، دەمزانی ئەگەرچی لە ئەنجامدا هەر دەچەسپێ ، بەڵام ماوەیەکی پێدەوێ تا رەعیەتەکەم لە خۆیدا دەتوێنێتەوە . کەچی .. کەچی کوڕەکەم ..

**شارات** : بەڵێ .. بەڵێ پادشام .. فەرمایشتت بەجێیە .

**پادشا** : کەچی بڕوانە .. ( بە دەست ئیشارەت بۆ پشتەوەی خۆی دەکا ) .. بڕوانە ئەو چارە ترش و تاڵانە .. ئەو سەروسیما دێوو درنجانە .. بە لامەوە زۆر سەیرەو بگرە زۆر ستەمە کە نموونەی ئەوانە لە بن دەستمەوە هەبن . گوایە تۆ بە لاتەوە سەیر نی یە ؟!. شتی وا دەبێ ؟!.

**شارات** : ( هەڵدەڕوانێ ) بەڵام پادشام ...

**پادشا** : ( ئاسایی و وەك فەرمانێك ) بیان سووتێنە ..

**شارات** : پادشام ..

**پادشا** : بە زەماوەندێکی تایبەتی .. زەماوەندێکی تایبەتی حەوت شەوو حەوت رۆژە .

**شارات** : پاشای خۆشی و شادمانی ی سەر رووی زەمین .. بمبەخشە .. شوێن ئیشارەتی پەنجەی پیرۆزت قوبلەگامە . بەڵام من هیچی تێدا نابینم .

**پادشا** : ( ئاوڕ دەداتەوە بۆ دواوە . دەحەپەسێ . ئینجا تووڕە دەبێ ) . پیلانگێڕن .. من لە جموجووڵی پیلانگێڕان غافل نیم من . من دەزانم چیم بەدی هێناوەو دەشزانم گریان پەرستان دەیانەوێ چی بکەن .

( رووی قسە دەکاتە شارات ) شارات .. ئومێدێکی زۆر گەورەم بە تۆ هەبوو .. کەچی کوا ؟!.

**شارات** : گەورەم .. پادشای شادی و پێکەنین .. من ..

**پادشا** : ( قاقایەکی پێکەنین و بە دوایدا ) بدەرەوە لە تەپڵی شادی .. جاڕ دە .. سەرلەنوێ جاڕ دەرەوە . من لە دڵسۆزیت .. لە باوەڕی پتەوت بە یاسا نەمرەکەم دڵنیام . دەنا ئەوەی تۆزێك لەمەوبەر بە چاوی خۆم و لە بن دەستمەوە دیم ، دەبوو وای لێبکردمایە گاڵدەم پێستت بکرێتە تەپڵەکەی ئەمجارە . سا راکە سەرلەنوێ جاڕدە ، پێش ئەوەی گاڵدەم ..

( بە دەم قاقایەکی ترەوە سەر شانۆ جێ دێڵێ )

**شارات** : ( شڵەژان و خەنینی لا تێکەڵ بە یەك دەبن . هاوار دەکا ) کارشا .. هۆ کارشا ..

**کارشا** : ( دێتە سەر شانۆ ) بەڵێ گەورەم ...

**شارات** : جاڕ دە .. خێرا دە ..

**کارشا** : ئەی جاڕم نەدا ؟!.

**شارات** : سەرلەنوێ جاڕ دە .. گاڵدە جاڕ دەنەوە .

**کارشا** : بەڵام ...

**شارات** : درێژەی مەدەرێ .. فەرمایشتی پادشای شادی و پێکەنینە .. زووکە گاڵدە ..

( سەر شانۆ جێ دێڵێ )

**کارشا** : ( هاوار دەکا ) ئاندی .. هۆ ئاندی ..

**ئاندی** : ( دێتە سەر شانۆ .. تەپڵێکی بە بەرۆکەوەیە ) بەڵێ گەورەم ...

**کارشا** : ئامادە بن .. جاڕ دەدەینەوە .

**ئاندی** : ( بانگ دەکا ) مارپۆ .. کەنداش ..

**مارپۆ / کەنداش** : ـ ( دێنە سەر شانۆ . دوو یاساوڵن ) بەڵێ ..

**ئاندی** : ئامادە بن .. جاڕ دەدەینەوە .

**کارشا** : ( دەچێتە پێش دەمی شانۆ )

**ئاندی** : ( دەچێتە تەنیشتی‌یەوەو خۆی ئامادەی تەپڵ‌لێدان دەکا ) .

**مارپۆ / کەنداش** : ـ ( لە پشتیانەوە لە لای راستو چەپیانەوە دەوەستن ) .

**کارشا** : ( نوسراوێك لە بەر پشتێنەکەی دەردێنێو دەیگرێ بە دەستەوە )

**ئاندی** : ( بۆ ماوەیەك دەدا لە تەپڵەکەی )

**کارشا** : ( نوسراوەکە دەخوێنێتەوە ) بە ناوی پادشای بەخشندەی پێکەنینو شادمانی‌ی لە بن‌نەهاتووەوە . ئەی خەڵکی گەرمیانو کوێستانی ئەم پەڕ تا ئەوپەڕی وڵات . گوێ قوڵاغ بن بۆ فەرمانی پیرۆزی پادشای سەردارو سەروەرتان . لەم ساتە بەدواوە ، گریان .. مرومۆچی .. رووگرژکردن .. ئاخو ئۆف هەڵکێشان .. کرووزانەوە .. خەفەت خواردن .. تەنانەت بیرکردنەوە لە خەفەت خواردن ، چ بە ئاشکراو چ بە نهێنی ، چ لە بەخەبەریداو چ لە خەودا قەدەغەیە . لەم ساتە بەدواوە ، دەبێ لە سەر ئیش .. لە حەوانەوەدا .. لە سەر شەقام .. لە کۆڵاندا .. لە ناو بازاردا .. لە دەشتو لە سەر شاخو لە ناو دارستاندا .. لە کونی ژوورەوەدا .. تەنانەت لە ناو جێگەو لە ژێر لیفەشدا ، تا خەو دەتانباتەوە هەر پێبکەنن .. هەر بخنێنەوە .. هەر دەمتان بە زەردەخەنەوە بێ .

ئەی خەڵکی گەرمیانو کوێستانی ئەم سەو تا ئەوسەری وڵات .. باش لە فەرمانی پیرۆزی پادشای سەردارو سەروەرتان ئاگادار بن . لە باری پانی ، دەرکەوتنی دوو دان بە لای راستداو دوو بە لای چەپدا . لە باری شاقوولی ، دەرکەوتنی نیوەی خوارەوەی چوار دانی سەرەوەو نیوەی سەرەوەی چوار دانی خوارەوە ، نیشانەی پێکەنین دەبێ . لەوە زیاتر پەسندەو کەمتر سەرپێچی‌کردنە لە فەرمانی پیرۆزی پادشا . سەرپێچی‌کردنیش ، پیلانگێڕانو ناپاکی‌یەو سزاکەی بەبێ تەنیا تۆز قاڵێك بەزەیی ، ریشەکێش‌کردنو سووتاندنی لاشەو بە بادانی خۆڵەمێشەکەی دەبێ بە دەم زەماوەندێکی حەوت شەوو حەوت رۆژەی پڕ لە شادی‌و پێکەنینەوە . ئیتر هەر کەسە ئۆباڵی خۆی بە ئەستۆی خۆی . ( سەر شانۆ جێ دێڵێ )

**ئاندی** : ( لە گەڵیدا سەر شانۆ جێ دێڵێ )

**کەنداش / مارپۆ** : ـ ( کەمێ دەکشێنە دواوەو لەم‌پەڕو لەوپەڕی شانۆوە رادەوەستن )

**رێبوار ـ1ـ** : ( بە دەم قاقای پێکەنینەوە رادەبووری ) .

**رێبوار ـ2ـ** : ( دوای ساتەوەختێك وەك ئەو )

**رێبوار ـ3ـ** : ( بێ پێکەنین رادەبووری )

**مارپۆ** : ( هاواری لێدەکا ) کوڕە بوەستە .

**رێبوار ـ3ـ** : ( رادەوەستێ )

**مارپۆ** : بۆ پێ‌ناکەنیت ؟!.

**رێبوار ـ3ـ** : بۆ پێ‌بکەنم ؟!.

**مارپۆ** : ( پەلاماری دەدا ) بۆ پێ‌بکەنیت ؟! .. ئائا! .. دەڵێ بۆ پێ‌بکەنم ؟!.

**کەنداش** : ( دەچێتە بن‌دەستی‌یەوە . شانی دەگرێ ) . فریای خۆت بکەوە .. پێ‌بکەنە .

**رێبوار ـ3ـ** : سەیرە ! .. چی قەوماوە ؟!.

**مارپۆ** : ( کەنداش کەلا دەخا ) ئای ! .. خۆ دەڵێ چی قەوماوە ؟!.

**کەنداش** : ( دەچێتەوە بن‌دەستی ئەو لایەوە ) نەگبەت .. فەرمانی پادشایە .. زووکە .. پێ‌بکەنە .

**رێبوار ـ3ـ** : ( دەداتە قاقای پێکەنینێکی تێکەڵ لە ترسو سام )

**مارپۆ** : ( دەستی لێ‌بەردەدا )

**رێبوار ـ3ـ** : ( بە دەم پێکەنینەکەیەوە بۆی دەردەچێ )

**مارپۆ** : ( بە دەم گلەیی‌و هەڕەشەوە ) کەنداش .. راستە ئێمە لە منداڵی‌یەوە برادەری یەکترین . بەڵام بۆ جاری داهاتوو وریای خۆت بە . لەم جارە بەدواوە گلەیی خۆت لە سەر خۆت دەبێ .

**کەنداش** : مارپۆ .. گوناهمان دەگا .. من دڵنیابووم کە نەی بیستبوو .

**مارپۆ** : گوناه گوناهی خۆیەتی . بۆ تەقەلای نەداوە بی‌بیسێ ؟.

**کەنداش** : دەگونجێ رێکەوتی کەسی نەکردبێ پێ‌رابگەیەنێ .

**مارپۆ** : دەبوو تەقەلابدا رێکەوت بکا .

**کەنداش** : کە هیچ کەسێکی تووش نەهاتبێ چۆن تەقەلا بدا !. خۆ غەیب زان نی‌یە !.

**مارپۆ** : کەنداش .. تکایە .. من ئامادەنیم یەکێکی تر سەرپێچی لەوفەرمانە پیرۆزەی پادشا بکاو من لەسەری ریشەکێش بکرێم وەکی تریش ، خۆت باش دەزانیت پیاو خراپ چەند زۆرن . کێ دەڵێ ئەو کابرایە بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە نەنێرابوو ؟ .. ها .. کێ دەڵێ ؟!.

**کەنداش** : ( خامۆش دەبێ )

**مارپۆ** : هۆشت بە خۆتەوە بێ . من لەوسەری هاتوومەتەوە .. ئەوەی کردت دووبارەی مەکەرەوە .

**کەنداش** : بەڵام ئاخر ..

**مارپۆ** : وتم دووبارەی مەکەرەوە . چونکە ..

**پیرێژن** : ( بەدەم کرووزانەوەوە دێتە سەر شانۆ )

**مارپۆ** : ( هاواری لێدەکا ) پیرێژن بوەستە .

**پیرێژن** : ( رادەوەستێ )

**مارپۆ** : بۆ پێناکەنیت ؟!.

**پیرێژن** : ( دەداتە پرمەی گریان )

**مارپۆ** : پیرێژنە سەرئاسنینە .. سەرمان بە فەتارەت مەدە .. دەی پێ بکەنە

**پیرێژن** : ( زیاتر بە کوڵ دەگری ) ( دەڕوانێتە ئەملاو ئەولا . دەچێتە بن دەستی یەوە )

داپیرە گیان هەرچیت لێقەوقاوە لە بیری خۆتی بەرەوە .. تەنیا بۆ ئەم ساتەوەختە لە بیری خۆتی بەرەوەو پێبکەنە . تکایە پێبکەنە .

**مارپۆ** : (بە رقەوە) کەنداش ..

**کەنداش** : داپیرە گیان .. تکایە .. فەرمایشتی پادشایە . دەبێ پێبکەنیت .

**پیرێژن** : ( لە گریان دەوەستێ . گوێ قولاغ دەبێ )

**کەنداش** : سوپاس داپیرە گیان .. سوپاس .. دەی .. دەی تین بدەرە بەرخوت . دەی تۆزێکیش ...

**مارپۆ** : (بەبێ ئارامی یەوە ) کەنداش ..

**کەنداش** : دانت دەربخە .. بە لای راستدا دووان .. بە لای ..

**مارپۆ** : ( شمشێری لێدەردێنێ ) ناپاک کەلاکەوە ...

**کەنداش** : ( دەحەپەسێ )

**مارپۆ** : گیان لە چنگم دەرناکەیت .. هەردووکتـان .. گیان لە چنگم دەرناکەن .. پێشم کەون .

**کەنداش** : مارپۆ .. بەزەییت لە دڵدا بێ . بۆ من نا .. بۆ ئەم پیرێژنە .

**مارپۆ** : زوو پێموتیت کە ئۆباڵی خۆت لە ئەستۆی خۆت دەبێ .

**کەنداش** : ( بۆ پیرێژن ) داپیرە گیان .. هەر کەسێکت مردوە ، رەحمەتی خوداو پادشای سـەرداروسەروەرمـانی لێ بێ . بەڵام تکایە پێبکەنە .. تکایە ...

**پیرێژن** : فەرمـانی پادشـایە کـە پێبکەنم ؟!.. ئـای کورە شیرینەکانم ... دەزانن کێم مردوە ؟!. شۆرە سوارێکم کـە لە تەمەنی ئێوەدا بوو . دەشزانن چۆن و بە چی مرد ؟!. من هەتا تۆزێ لەمەوبەر نەمدەزانی . وا ئێستا زانیم . لە دەمی ئێوەوە زانیم . من تەنیا هێندەم پێوترا کە پادشا فەرمـانی کوشتنی داوە . کەچی وا ئەوەتا ئێوە بۆمی روون دەکەنەوە کە بۆچی و چۆن کوژراوە . بەڵام یازووخ کورە شیرینەکانم .. یـازوخ بۆ ئێوەی لاوی خوێن گـەرم .. یازووخ .. کـورەکەم لە تـەمەنی ئێوەدا بوو .

**کەنداش** : ( سەر دادەخاو خۆی دەخواتەوە )

**مارپۆ** : ( پەلاماری پیرێژن دەدا ) پیرێژنە سەرئاسنینە .. بەم قسە پڕوپووچانەت نام خەڵەتێنیت . من پادشای سەرداروسەروەری خۆمم خۆشدەوێ و سـەرم لە رێی فەرمـایشتیدا بەخت دەکەم .

**پیرێژن** : گوناحیت کورە شیرینەکەم .. گوناحیت ..

**مارپۆ** : لەوە زیاتر چەنە مەدە .. پێشم کەوە بەرەو وەرگرتنی سزای هەقیانەتی خۆت .

**کەنداش** : ( بە پارانەوەوە ) مارپۆ .. بەزەییت لە دڵدا بێ .

**مارپۆ** : ( پیرێژن دەداتە پێش خـۆی ) تۆش ئـۆباڵی خـۆت کەوتۆتە ئەستۆی خۆت . هەقی گلەییت بە سەرمەوە نەماوە . خۆت دەبینیتەوە . ( پیرێژن دەداتە پێش خۆی . سەر شانۆ جێدێڵن )

**کەنداش** : ( سەر بە سەر ملدا شۆڕ دەکاتەوە . لە جێی خۆی دەچەقێ ) (تاریکی) [ دیمەنی دووەم ]

( شوێن ناو گۆڕستانێکە . هەردوو پاریدەدەری زانا خۆیان تێدا حەشارداوەو لە حاڵەتی ترس و سامدان )

**پاریدەدەر—1—** : وتم دوکتـۆر مەکـە .. وتم دوکتۆر دەستم دامێنت لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوەو سەری ئەم تابووتـە لەعنەتی یە هەڵمەدەرەوە ، بە قسەی نەکردم .

**پاریدەدەر—2—** : کورە بگرە من راست و راست پێموت کـە

ـوەری تەواوم بەو نووسینەی سەر تـابووتـەکە هـەیە . وتم ـوکتۆر ، لەعنەتی فیرعەونەکان کەم کەسی نەکوشت . ئەمیش ـەعنەتێکە لەو بابەتەو با لە خۆمانی نەوروژێنین .

**یاریدەدەر — 1 —** : یا تۆ بڵێ : ئەویان تەنیا نوسرابوو ( لەعنەت ـەو کەسەی تابووتم هەڵدەداتەوە ) . لە کاتێکدا ئـەمیان بـە ـەمی خـۆی هاواری دەکـرد : « نەکـەی سـەری تـابـووتم هەڵبدەیتەوە » . ئەگـەر ڕاستت دەوێ ئەو بێ غـەش و غایلە بیاوەتیی خۆی لە گەڵدا کردبووین . بەڵام ئێمە .. داخ ئێمە خۆمان ...

**یاریدەدەر — 2 —** : ئێمە خۆمان گەوجێـک بووین ئـاومان لێـل نەدەکرد .

**یاریدەدەر — 1 —** : ئێستا چی بکەین !.. چار چی یە ؟!.

**یاریدەدەر — 2 —** : چار ؟!.. چار ئەوەیە هەتا ماوین هەر کاڵەك بە ئەژنۆ بشکێنین !.

یاریدەدەر — 1 — : هەتا ماوین ؟. بۆ لە تـۆ وایە هـەتا کـەی دەمێنین ؟!.

**یاریدەدەر — 2 —** : دەزانم .. یەك دوو سەعـات .. یەك دوو ڕۆژی تر .. لەوە بەولاوە نی یە . بۆیە منیش وای تێدەگەم کە لە کاڵەك شکاندنمان بە ئەژنۆ زیاتر بۆ نەماوەتەوە .

**یاریدەدەر — 1 —** : بەڵام نابێ نابێ وابێ .. دەبێ چارەسەرەك بدۆزینەوەو هەر کلۆجێك بێ خۆمان ڕزگار بکەین .

**یاریدەدەر — 2 —** : چارەسەرو ڕزگار بوون ؟!.. (بە تەوسەوە) وەلا ئەوە مەگەر تەنیا لە دەست جەنابی دوکتۆر بێت !.

**یـاریدەدەر — 1 —** : دوکتـۆر ؟!.. بەڵام کـوا دوکتۆر ؟!. کێ دەزانێ لە کوێیەو چی بە سەر هاتوە ؟.

**یاریدەدەر — 2 —** : من دەزانم .. جەنابی دوکتۆر ئێستا کراوە بە تۆپێك و یاساوڵەکانی پادشا هەروا بۆ سەیرو سەفای پادشا تۆپ تۆپێنی پێدەکەن .

**زانا** : ( لە سەر شانۆ و بێ ئەوەی یـاریدەدەرانی ببینێ ، بـە ترسەوە دێتە سەر شانۆ لە یەکتری ئاشکرا دەبن )

**یاریدەدەر — 1 —** : ( بە پەرۆشەوە ) دوکتۆر ..

**یاریدەدەر — 2 —** : دوکتۆر .. فریامان کەوە .. چار .. چارمان چی یە ؟!.

**زانا** : ( ماندووە . بێ وەرامدانەوە دادەنیشێتە سەر زەوی

**یاریدەدەر — 1 —** : دوکتۆر .. تۆ جارێ بۆمان باس بکە .. چیت لێ بە سەر هات .. ئەم ماوەیە لە کوێ بوویت و چیت دی ؟!.

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : چۆن زانیت ئێمە لێرەین ؟!

**زانا** : نەمدەزانی ئێوە لێرەن .. لەکوێوە بزانم ؟ .

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : ئەی چۆن هاتیت بۆ ئێرە؟ !

**زانا** : ئێوە چۆن هاتن ؟ .

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : وتمان گۆڕستان بۆ خۆحەشاردان لە هەموو شوێنێکی تر سەلامەتترە .

**زانا** : تەواو .. منیش وەك ئێوەی بۆ چووم .

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : (بە گومانەوە سەیرێکی یـاریدەدەر ـ 1 ـ دەکا) تەنیا هێندە ؟ !

**زانا** : (ئاسایی) ئا ..

**یاریدەدەر ـ 1 ـ** : (قسـەکەی یـاریدەدەر ـ 2 ـ پشت گـوێ دەخا) .

دوکتۆر .. تکایە بۆمانی بگێڕەوە .. چیت بە سەر هات . بمان بەخشە .. ئێمە خۆمان پێرانەگیرا کە ئێمە هەڵاتین ، جەنابی پادشای ناپادشا چی کرد ! ؟ .

**زانا** : ئەوەیان پێ نازانم . چونکە منیش دوای ئێوە بە چـەند ساتێك هەڵاتم . منیش خۆمم پێرانەگیـراو هەڵاتم . ئـەوەیان هیچ . ئێوە چیتان دی منیش هەر ئەوەم دی . بەڵام دوایی .. دوایی ...

**یاریدەدەر ـ 1 ـ** : دوایی چیت دی ؟ ! .

**زانا** : ڕیشەکێش کردن .

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : ڕیشەکێش کردن ؟ ! . ڕیشـەکێش کردن چی یە ؟ ! .

**زانا** : (دەیەوێ باسی بکاو بۆی ناکرێ) ڕیشەکێش کـردن .. یانی .. زەلامێك .. یانی من یا تۆ دێنن .. هێن .. ئاوا .. ملی ... ئیتر .. نازانم .. وازم لێ بێنن .

**یاریدەدەر ـ 1 ـ** : یانی ملی هەڵدەکێش .. وەك چۆلەکـە ملی هەڵدەکێشێ ؟ ! .

**زانا** : (سەر بۆ سەلماندنی قسەکە ڕادەوەشێنێ)

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : یانی تۆ بە چاوی خۆت دیت ؟ !

**زانا** : (ئەمجاریش وەك جاری پێشوو سەر ڕادەوەشێنێ .

**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : واتە هەر هێنـدەی بەر دەستیـان بکەوین ڕیشە کێشمان دەکەن ؟ ! .

**زانا** : بێگومان .
**یاریدەدەر ـ 2 ـ** : ئەی دەفەرموو جەنابی دوکتۆر بە فریامان بکەوەو ڕزگادمـان بکە .. دەفـەرموو . وەك ئـەئاوا تـووشت کردووین ڕزگاریشمان بکە ! .
**زانـا** : (بەبێ دەسـەڵاتی‌یەوە سـەیـرێکی دەکـا) سـەبـرم لێبگرن .. باپشوویەك بدەم ئەوسا بیرێکی لێدەکەمەوە .
**یـاریـدەدەر ـ 2 ـ** : پشـوویـەك بـدەیتو ئینجـا بیـرێکی لێبکەیتەوە ؟ ! ... (بۆ یاریدەدەر ـ 1 ـ) . گوێت لێیە ؟ ! .. ئێمە ها ئێستا ها ساتێکی‌تر دەگیرێین‌و ریشەکێش دەکرێینو کەچی ئەو ...
**پاسەوانی‌کـوڕستان / دوولاو** : (لە سـووچی بنەوەی لای لاڕاستی شانۆوە بە بەرگی کۆنەوە دەردەکەون)
**زانا / یاریدەدەرانی** : (خۆیان دەشارنەوە)
**پاسەوان / دوولاو** : (دێنە پێش دەمی شانۆ)
**پاسەوان** : (لە سەر بەردێك دادەنیشێ) تا ئێستا ئەوە چلو چوار ! .
**لاو ـ 1 ـ** : چلو چوارەمین بە نەسیبی ئێمە بوو . ئەگـەر وا بڕوا هەشتاو هەشتەمین من دەبم .
**لاو ـ 2 ـ** : یاخود من .
**پـاسەوان** : نـەء کوڕە شیـرینـەکـانم .. نـەء .. من دەبمو ئـاواتەخـوازیشم من بم . وا مەرگی یـەکەمتـانم بینی‌و خۆم دەزانم چ چنگ‌و نینۆکێك جەرگ‌و دڵم پارە پارە دەکا . تکاتان لێ دەکەم .. لێتان دەپاڕێمەوە .. ئێوە وەك کاکتان‌و من مەکەن . بە پێی فەرمایشتەکە کردار بکەن‌و خۆتان لە ڕیشە کێش‌کردن ڕزگار بکەن .
**لاو ـ 1 ـ** : (بۆ باوکی بە چۆکدا دێ) بابە .. چۆن داوای شتی وەهامان لێدەکەیت ؟ ! . تۆ خۆت فێرت کـردووین کە ئـەگەر سەریشمانی تێدا بچێ ، قەت مـل بۆ زۆرو جـەور نەدەین . کاکیشمان هەر بە پێی ئەو ئامۆژگاری‌یەی کردو من دڵنیام کە لێی پەشیمان نی‌یەو ئەگەر زیندووی بکەیتەوەو بیخەیتەوە بەر هـەمان تـاقیکردنـەوەوە ، ئەو هـەڵوێستەی خـۆی دووپـات دەکاتەوە .
**پـاسـەوان** : کـوڕەکـەم .. لێـم مـەگـرە .. مـنـیش لە ئامۆژگاری‌یەکەم پەشیمان نیم . بەلام ڕەنگە ...
**لاو ـ 2 ـ** : ڕەنگـە چی ؟ ! .. زۆرو جـەوروپـادشـایـەکی ئەگریسی زۆردار دەیکاو بە وێنەیەکیش کە مەگەر هەر ئەهریمەن زەفەری پێ بەرێ ! .
**لاو ـ 1 ـ** : ئەهریمەن ؟ ! .. ئەهریمەن کەی شتی وەهای بە بیردا هاتوە ؟ ! .. ئەوەتەی ئەهریمەن ئەهریمەنەو ئەوەتەی ئەو نەخشە بۆ شـەڕ خوایی دەکێشێ‌و مـرۆڤیان پێ مـوبتەلا دەکا ، قەت‌وقەت نەبیستراوە زەفەری بـەم شێوەیـەی زۆرو جەور برد بێ .
**لاو ـ 2 ـ** : بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانـە ! .. لە کوێـوەی هێنا ، لە کوێوە ؟ ! .. چۆن بیری بۆئەم بابەتە زوڵم‌و زۆرکردنە بێ‌وێنەیە چوو ؟ ! ... گریان .. مرومۆچی .. کرووزانـەوە .. تەنانەت بیرکردنەوە لە خەفەت خواردن ، قەدەغەیە ! . دەبێ هـەر پێبکەنن .. لە ژێـر لێفەشـداو خەو دەتـانبـاتـەوە هەر پێبکەنن .
بابە .. ئاگات لێیە .. ئێستا ئێمە دەبێ بدەینە قاقای پێکەنین . بـە ڕیشـەکێش‌کـردنی کـاکم بـدەینـە قـاقـای پێکـەنـین .. دەتوانیت ؟ ! .
**لاو ـ 1 ـ** : لە باری پانی دەرکەوتنی دوو دان بە لای ڕاستداو دوو بە لای چەپدا ! .. دەتوانیت ؟ .
**لاو ـ 2 ـ** : لە باری شاقوولی ، دەرکەوتنی نیوەی خوارەوەی چوار دانی سەرەوەو نیوەی سەرەوەی چوار دانی خوارەوە . دەتوانیت ؟ ! .
**لاو ـ 1 ـ** : لەوە زیاتر پەسندەو کەمتر سـەرپێچی‌کردنـە لە فەرمانی پیرۆزی پادشا .. دەتوانیت ؟ .
**لاو ـ 2 ـ** : بابە .. تکایە .. دەتوانیت ؟ .
**پاسەوان** : (ڕادەپەڕێتە سەرپێ) نەء .. هەرگیز نەء .. هەرگیز نەء ..
**لاو ـ 1 ـ / لاو ـ 2 ـ** : (کەمێك لێی دەکشێنە دواوەو بێدەنگ بەرەو رووی دەوەستن)
**پاسەوان** : (خۆی دەخواتـەوەو بە حیـدەتەوە) لەعنـەتت لێ بێ .. لەعنەتی ئاهووڕات لێ بێ هەی جانەوەری خوێن خۆری شەڕخوای بێ‌وێنە . هەی لەئەهریمەن چەپەڵتر . تۆ لە کوێوە هاتیت‌و لە چ قوڕنەیەکی دۆزەخرا بەسـتـرابوویتـەوەو بەرەڵا کـرایت ؟ ! . کێ بوو بـەرەڵای کردیت‌و وەك ئـەژدیهایـەکی قوورەتی بەرێدایتە گیانی ئێمە ؟ ! ... کێ بوو ؟ ! .
**لاو ـ 1 ـ** : بابە .. هێور بەرەوە .. تکایە هێور بەرەوە .

**پاسەوان** : (بە تەوسەوە)
پادشای خۆشی و شادمانی ! .. کەم و زیادی نی یە ! .. چل و چوار .. لە ماوەی دوو سەعاتی دوای بڕیاری بەخشینی خۆشی و شادمانی ، چل و چوار سەر لە لەش جیا کرانەوە .. چل و چوارەمینیش جگەر گۆشەیەکی خۆم بێ ! . لەعنەتت لێ بێ .. لەعنەتت لێ بێ هەی پادشای ڕیشەکێش کردن .
**لاو ـ 2 ـ** : بابە .. بابە گیان .. لەسەرخۆ بە .. تکایە لە سەرخۆبە .
**پاسەوان** : (هێمن دەبێتەوە . لە جێی خۆی دادەنیشێتەوەو خامۆش دەبێ) .
**لاو ـ 1 ـ /لاو ـ 2 ـ** : (لەم شان و لەو شانی یەوە ڕادەوەستن و لە چاوەڕوانیدا دەمێنینەوە) .
**زانا / یاریدەدەرانی** : (خشپەیەکیان دێ)
لاو ـ 1 ـ / **لاو ـ 2 ـ** : (لێیان بە ئاگا دێن)
**پاسەوان** : (وریا دەبێتەوەو ڕادەپەڕێتە سەر پێ)
**لاو ـ 1 ـ / لاو ـ 2 ـ** : (شمشێر دەردێنن و یەکەم بۆ لای ڕاست و دووەم بۆ لای چەپی شانۆو بەرەو قوولایی دەچن . زاناو یاریدەدەرانی بەدی دەکەن و دەیانهێنن) .
**پاسەوان** : (پیایاندا هەڵدەڕوانێ . بە سەرسامی یەوە) ئێوەچین و کێن ؟ ! .
**زانا / یاریدەدەرانی** : (وەرامیان بۆ نادرێتەوە . بە بەرگی ئاسایی خۆیانەوەن)
**لاو ـ 1 ـ** : جاسووسی پادشان .
**لاو ـ 2 ـ** : بە ئاشکرا دیارە . بڕوانە چۆن ترسی مردن زارەترەکی کردوون .
**لاو ـ 1 ـ** : ڕیشەکێش کردنتان بە فەرمانی پادشای خۆشی و کامەرانی بە لاوە چۆنە ؟ ! .
**لاو ـ 2 ـ** : زۆر خۆشەو جێی خۆیەتی .
وانا ؟ ! .
**لاو ـ 1 ـ** : بابە .. بڕوانە .. ئەم سەرپێچی کەرە نەگریسانە پێناکەنن ! .
فەرمایشتت بە چی یە ؟ ! .
**لاو ـ 2 ـ** : جا ئەوە فەرمایشتی بابمانی بۆ چی یە ؟ ! .. سەرپێچی کەرن لە فەرمایشتی پادشاو واتە پیلانگێڕن و برایەوە . دەبێ بێ چەندو چۆن ڕیشەکێش بکرێن . وانی یە بابە ؟ ! .
**پاسەوان** : (سەریان بۆ هەڵدەبڕێ و تێیان دەڕوانێ) . ئێوە کێن ؟ ! .
**زانا** : (بە پەشۆکاوی یەوە)
ئێمە .. من زانای شوێنەواری کۆنم .. یانی من .. گوایە من ..
**پاسەوان** : ئەی ئەوانە ؟ ! .
**زانا** : ئەوانە .. ئەوانەش یاریدەدەرمن .
**پاسەوان** : واتە تۆ بوویت ؟ ! .
**زانا** : (مل کەچ دەوەستێ و وەرام ناداتەوە) .
**پاسەوان** : بۆچی وەهات کرد ؟ ! .
**زانا** : (هەر وەرام ناداتەوە) .
**پاسەوان** : (بە کەمتەرخەمی یەوە) دانیشن .
**لاو ـ 1 ـ** : بابە ... بابە تکایە ..
**پاسەوان** : (وەك فەرماندەیەك) دانیشن .
**زانا / یاریدەدەر** : (دادەنیشن) .
**پاسەوان** : (وەك حیکایەتێك بگێڕێتەوە) گوێ بگرن .. دەگێڕنەوە کە لە زەمانی زوودا دوو کارەسات قەوماوەو ئادەمیزادی ئەم سەر زەمینەی هێناوەتە ژەنگ و ژار .
یەکەمیان تۆفانێك دووەمیان گورگێك . تۆفانەکە هەرچی یەکی هاتۆتە سەر ڕێ ڕای مالیوەو دووەمیان هەرچی یەکی تووش هاتووە کەلەپاچەی کردووە ! . بەلام وا ئێستا کارەساتی سێیەم ڕوو دەدا .. کارەساتی سێیەم نە تۆفانەو نە خستنەکاری کەلبەی گورگە بێ ئامانەکە . ئەمیان مۆریانەیەکەو دەکرۆژێ . ئەمیان گیان و دڵ و دەروون و هەست و نەست دەکرۆژێ و ئیتر ئادەمیزادو ئاژەڵ و ڕووەك و دارو بەردی بێ گیان هەموو چۆن یەك دەبن . پادشای خۆشی و شادمانی هیچ جیاوازی یەك لە نێواندا ناهێلێ . ئەوەشی سەرپێچی لەم فەرمانەی دەکا ، ڕیشەکێش دەکرێ و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ، پادشا دەبێتە سەردارو سەروەری وردو درشتی هەموو شتێك و هەموو شتەکان بە گیاندارو بێ گیانەوە دەبنە پەپوولەی دەوری چرای ئەو . ئەمەت پێ خۆشە ؟ ! .
**زانا** : هەرگیز نەء ... هەرگیز نەء ..
**یاریدەدەر ـ 1 ـ / یاریدەدەر ـ 2 ـ** : هەرگیز پێمان خۆش نی یە قوربان .. پێمان خۆش نی یە .
لاو ـ 1 ـ : بابە .. گوایە تۆ باوەڕت وایە کە ئەمانە جاسووسی

پادشا نین ؟ ! .
**پاسەوان** : نە کورەکەم .. نەء .
**لاو ـ 2 ـ** : بابە .. بە چیدا دەزانیت ؟ ! .
**پاسەوان** : دەزانم کورِم .. دڵنیا بن .. ئەمانیش لە ترسی ریشە کێش‌کردن هەڵاتوون . گومانتان لە دڵدا نەمێنێ . (رووی دەم دەکاتە زاناو یاریدەدەرانی)
بــە هــەرحــاڵ ، وا ئـێـستــا چــارەنــووسـتــان لە گــەڵ چارەنووسماندایــە . بە دەستی خــۆتان چـاڵتان بــۆ خــۆتــان هەڵکەندو خۆتان خستە بــەر مەتـرسی ی یاسـاکەی پـادشای خۆشی‌و شادمانی‌یەوە . ئێستا فەرموون بدوێن . چی دەکەن‌و نیازی چیتان هەیە ؟ ! .
**زانا** : (هاتۆتەوە سەرخۆی بە خەفەتباری‌یەوە) خەتـای ئێمە بوو .. بمان بەخشن .
**یاریدەدەر ـ 1 ـ / یاریدەدەر ـ 2 ـ** : (پێکەوە) خەتای تۆنەك ئێمە .
**زانا** : (بە تووڕە بوونەوە) ئەی بۆ لە گەڵدا هاتن
**یاریدەدەر ـ 1 ـ / یـاریدەدەر ـ 2 ـ** : بـە زۆر هێناتـین .. هەڵتفریواندین .
**زانا** : وا نی‌یە .. ئێوە ...
**پاسەوان** : (قسەیان پێدەبڕێ) تکایە .. تکـاتان لێ‌دەکـەم . وەختی ئەم رازو گلەیی‌یە نی‌یە ، چونکـە بێ‌سوودە . هـەڵی بگرن بۆ وەختی خۆی . ئێستا لەوە بدوێن کە دەبێ چی بکەن‌و چۆن ئەم گرفتە سەختە چارەسەر بکـەن . بۆ خـۆشتان‌و بـۆ ئێمەش وەها چاکتر نی‌یە ؟ .
**زانا / یاریـدەدەرانی** : (دەڕواننە یـەکتر . روو دەکـەنەوە پاسەوان . سەری رەزامەندی‌ی بۆ دەلەقێنن)
**پاسەوان** : (رووی دەم لە زانا دەکا) چاکە .. فەرموو .. چی بە باش دەزانیت ؟ .
**زانا** : (هەڵدەستێتـە سەرپێ . دەکـەوێتە هـات‌و چۆکـردن‌و بیردەکاتەوە)
**پاسەوان / لاو ـ 2،1 ـ**
**یاریدەدەر ـ 2،1 ـ** : (چاوەڕوانی وەرامی لێدەکەن)
**پاسەوان** : (کە هەر وەرامی لێ‌نابیسێ ، رووی قسە دەکـاتە یاریدەدەرانی) ئەی ئێوە .. ئێوە دەڵێن چی ؟ !
**یـاریدەدەر ـ 2،1 ـ** : (دەڕواننـە یەکتـر . دەکـەونـە هـات‌و چۆکردن‌و بیر دەکەنەوە)
**پاسەوان** : (هەر لە سەر باری دانیشتنەکەی خۆیەتی)
**لاو ـ 2،1 ـ** : (هەر لەم شان‌و لەو شانی‌یەوە راوەستاون)
**پاسەوان** : (لەسـەرخۆ هـەڵدەستێتە سـەرپێ) تکایـە گوێم لێ‌بگرن .. گوێم لێ‌بگرن من پێتان بڵێم دەبێ چی بکەن .
**زانا / یاریدەدەرانی** : (وریا دەبنەوە)
**پاسەوان** : کـورِەکانم .. تـاقە چـارەسەر لە بـەر دەمتانـدا ئاخنینەوەی پادشایە بۆ ناو تابووتەکەی .
**زانا / یاریدەدەرانی** : (لێی دێنەوە پێشەوە)
**پـاسەوان** : چـەندیش دەست‌و بـرد بکـەن بـاشتـرە .. بـۆ خـۆشتان‌و بـۆ ئەو هــەزاران هەزار سـەرەی بە رێـوەن بـە ریشەکێش‌کردن لە لەشیان جیا بکرێنەوە باشترە .
**زانا** : (بە پەشۆکاوی‌یەوە) بەڵام .. بەڵام چۆن ؟ ! .
**پاسەوان** : (بە تەوەسەوە) چۆن سەریت هەڵدایەوە ؟ ! .
**زانا** : ئاسان بوو .. سەرقاپێك‌و بە یاریدەی ئەم زاتانە (دەس بۆ یاریدەدەرانی درێژ دەکا) دەستمان دایەو لاماندا .
**یاریدەدەر ـ 2،1 ـ** : (پێکەوە) ئەو کارە نەگریسەت بە زۆر بە ئێمە کرد .
**زانا** : (بە تووڕەیی‌یەوە)
بە زۆر نەبوو .
**پاسەوان** : (بە تەوسەوە)
هەمدیس ؟ ! . وتمان وەختی نی‌یە (بۆ زانا)
کت‌ومت بە چەشنی لادانەکە .. سەرقاپـەکە بنێـرەوە جێ‌ی خۆی .
**زانا** : (هەر بە پەشۆکاوی‌یەوە)
ئەی ئاخر .. ئاخر ...
**پاسەوان** : (هەر لەسەرخۆ)
بڵێ .. بڵێ بزانم .. ئەی ئاخر چی ؟ ! .
**زانا** : (خۆی هێور دەکاتەوە)
یەکەم : چۆن دەستمان بگاتەوە تابووتەکە . دووەم : چۆن ئەو جانەوەرە جەربەزەیە بە گیر بێنین‌و بیخەینەوە ناو تابووتەکە .
**پاسەوان** : (نەرمە پێکەنینێك)
گوێ بگرە : بۆ یەکەم : ئێمە خۆمان دەستت دەگەیەنـین بە تابووتەکە . بۆ دووەمیش : دوایی من تێتاندەگەیەنم چۆن .
**زانا** : ئەگەر وەها بێ ئاسانـە . بەڵام چـۆنی بەجێ بێنـین‌و

کەی ؟ ! .
پاسەوان : بۆ چۆنێتی یەکەی ئێستا دەچینەوە ماڵەوە لە سەری ڕێ دەکەوین . بەڵام کەی بەجێ بهێنرێ ، ئەوا من بە پێویستی دەزانم کە هەر ئەمشەو بێ و بەوە دەتوانین چەند سەد ملێك لە ڕەشەکێش کردنی سبەینێ ڕزگار بکەین .
زانا : (بۆ یاریدەدەران)
دەڵێن چی ؟ .
یاریدەدەران : ئامادەین .
تاریکی)

## دیمەنی سێیەم

(سەر شانۆ ڕووناك دەکرێتەوە . پادشا بۆ تابووتەکەی لە سوژدەدایە ، تابووت سەری هەڵدراوەتەوە) .
**دەنگ** : (دەنگی هێزی سەروەری پادشایە) وریابە .. من تەواو لێت ڕازی نیم . هێشتا ئاسوودەت نەکردووم .
**پادشا** : (هەڵدەستێتە سەرپێ . بە ڕێزلێنانـەوە) بمبەخشـە سەروەرم .. کەم و کووڕیم چی یە ؟ ! .
**دەنگ** : یاساکەم .. من لە ناو هەزاران پادشاو میرو پادشاو میرو سەرداردا ، تۆم هەڵبژاردو پشتم پێت بەست . تۆم بەو خاوەن دەست و مەچەکە پۆلایینە دانا کە ئەو یاسایەم بە سەر ڕەعیەتەکەمدا بۆ بسەپێنیت .. بەڵام کوا ؟ ! .
**پادشا** : گەورەم .. چۆنت نەخشە بۆ کێشام و چۆنت وت وەهام کرد .
**دەنگ** : هێشتا هەن سەرپێچی لێدەکەن .
**پادشا** : دەیان پلیشێنمەوە .. دەیـانهاڕم .. بـەرەچەڵەکیـانا دەچمە خوارەوە .
**دەنگ** : کوا .. کەی ؟ ! .
**پـادشا** : هـەر ئێستا .. مـۆڵەتم بدە .. تکـایە مـۆڵەتێکی ترم بدەرێ .
**دەنگ** : دوا مۆڵەت ؟ .
**پادشا** : دوا مۆڵەت .
**دەنگ** : (بە دەم کزبوونەوە)
**وریـابە .. ئـەمە دوا مـۆڵەت دەبێ .. دوا مۆڵەت .. دوا مۆڵەت ..**

**پادشا** : (دەنەڕێنێ)
**شارات** .. کوڕە شارات ..
**زانا** : (دێتە سەر شانۆ)
**پادشا** : (پشتی لێ یەتی)
**زانا** : **(بە تەوسەوە)**
**ئەمرکە پادشای خۆشی و شادمانی**
**پـادشا** : (بـە سەرسـامی یەوە وەردەگـەڕێ . بـە بینینیـان رادەچڵەکێ و دەکشێتە دواوە)
**زانا** : جەناب ئیتر کۆتاییتە .
**پادشا** : شارات .. **هۆ** .. شارات ...
**زانا** : عەزێت مەکێشە .. **هەموو** شاراتەکـانت بە گـۆڕەکانی خۆیان شادو شوکور بوونەوەو لە نەڕەنەڕو شاتەشاتت ڕزگاریان بووەوە .
**پادشا** : (بێدەنگی)
**زانا** : هەروەها جەنابیشت دەبێ بەم تابووتـە لەعنەتی یـەت ناشادو ناشوکور ببێتەوە .
پادشا : (بە تەوسەوە)
من ؟! ...
**زانا** : **ئاتۆ .. ئا بەڵێ تۆو بۆ هەتا هەتایە** .
**پادشا** : (بەهێواشی پێدەکەنێ)
**زانا** : دەتبینم پێدەکەنیت .
**پادشا** : **(دەداتە قاقای پێکەنین)** .
**زانا** : وا دیارە زۆر لە خۆت دڵنیایت ؟ !
**پادشا** : (هەر بە دەم کوڵی پێکەنینەوە)
وتت ....
**زانا** : ئا بەڵێ ..
**پادشا** : بۆ هەتا هەتایە ..
**زانا** : بەڵێ .. بۆ هەتا هەتایە .
**پادشا** : (پێکەنینی خاو دەبێتەوە)
کوا بزانم ! ..
**زانا** : جەنـاب ڕەنگە تـۆ بە قسـە پڕ فـرت و فێڵەکانی سـەر تابووتەکەت پشت ئەستوور بیت ! .
**پادشا** : (بێ پێکەنین)
بێگـومان .. ئـەی نابینیت لە ئـەنجامیـانـدا چیم بـە سـەر هێناویت ؟ ! .

**زانـا** : ئێستا ئیتـر دادت نادەن ! .. چـوومە بنـجو بناوانی هەموویانەوە .
**پادشا** : هەموو ، هەموو ؟ ! ..
**زانا** : هەموو ، هەموو .
**پادشا** : ئەوەشی کە دەڵێ ...
**زانا** : (قسەی پێدەبڕێ)
گیاندار یەکجار دەمرێ ... ئا بەڵێ ئەوەشیان .
**پادشا** : (دەشڵەژێ)
**یەعنی ...**
**زانـا** : یەعنی ئـەویش دادت نادا .. چـوومە بنـجو بنـاوانی ئەویشەوە . بۆیە چاوەڕوانی ئەوە مەکە بە مراندنی ئاسـایی بتمرێنمەوە .
**پادشا** : (بە سەرسامی‌یەوە)
یەعنی ...
**زانا** : یەعنی ...
(پەنجە بۆ تابووتەکە ڕادەکێشێ)
**پـادشا** : (شێتگـیر دەبێ) . پشت دەکاتـە تابـووتەکـەو باڵ بڵاودەکاتەوە)
نا .. نا .. نابێ .. ناشێ .. ناتوانیت ..
**زانا** : (ئیشارەت بۆ لای ڕاست یا لای چەپی شانۆ دەکا)
وەرن ...
**یاریدەران** : (دێنە سەر شانۆ)
**سێقۆڵی** : (لێی دەچنە پێش)
**پادشا** : (زیاتر دەکشێتە دواوە)
نا .. نا .. ناتوانن .. نایەڵم .. نایەڵم ..
**زانا** : وتم کۆتاییتەو بۆ هەتا هەتایە .
**پادشا** : (بە پاڕانەوەوە)
مەکەن .. تکایە .. مەکەن .. تکایە .
**زانا / یاریدەدەران** : (زیاتر لێی دەچنە پێش)
**پادشا** : (بە هەڕەشەوە)
**دەتـانهـارم .. دەتـانپلیشێنمـەوە .. ریشـسـەکێشتـان دەکەم .. لاشەکانتان دەسووتێنمو خۆڵەمێشەکەیان بە با دەدەم ...**
**زانا / یاریدەدەران** : (زیاتر لێی دەچنە پێش و دەستدەدەنە یەخەی و هەردو باڵی دەگرن)

**پادشا** : (دەپاڕێتەوە)
تکایە .. دەستم دامێنتان .. بەزەیی .. تۆزێ بەزەیی .. نا .. مەکەن .. نا .. بێدەسەڵاتم .. بێدەرەتانم .. مەکەن .
**یـاریدەدەران** : (بـە پـاڵەپـەستـۆ لە تـابـووتـەکـەی دوور دەخەنەوە) .
**زانـا** : (دەچێ بـە لای تـابـووتـەکـەوەو دەس دەگـرێ بـە سەرقاپەکەیەوە)
**پادشا** : (خۆی رادەپسکێنێ . بە هەڕەشەوە) سـەرتان پـان دەکەمەوە .. بە ڕەچەڵەکتاندا دەچمە خوارەوە . دنیاتان بـە سەردا وێران دەکەم .. بگرە هەموو دنیا بە سەر یەکدا و بە سەر خۆشمدا وێران دەکەم . دوای من نابێ کەس بمێنێ .. نابێ هیچ شتێك بمێنێ .. نابێ دنیا بمێنێ ..
**زانا** : (بە ڕقەوە سەرقاپی تابووتەکە بە توندی دادەداتەوە)
**پـادشا** : (ئـاسایی لە دەس یـاریدەدەران بـەر دەبێ . وەك تارمایی‌یەك پاشەوپاش سەر شانۆ جێ‌دێڵێ) نابێ دنیا بمێنێ .. نابێ .. نابێ .. نابێ ..
**زانا** : (دێتە پێش دەمی شانۆ)
بەڕێزان .. بمبەخشن .. خۆ بۆتان دەرکـەوت کە من چـەندە مێـژووناسو زانـای پشکنینی شوێنـەواری کۆنم ، هێنـدەش ئەکتەرێکی چاکمو وەك بینیتان دەتوانم باش تێکەڵ بە یەکتریان بکەم . من بەش بە حاڵی خۆم لەم ڕووەوە لە خۆم دڵنیام . بەڵام هێندەی مەسەلە پەیوەندی‌ی بە ئێوەوە هەبێ ، ئاواتەخوازی ئەوە دەبم کە دڵی کەستانم نەیەشاندبێو خوانەخواستە هیچ نووکە دەرزی‌یەکم نەکردبێ بە بنی نینۆکی کەستاندا . باوەڕم پێ‌بکەن من کابـرایەکی زۆر دڵسـافمو ڕقم لە کەس نی‌یـەو حەزیش ناکەم کەس ڕقی لێم بێ .. بەڵام تەنیا هێندە هەیە کە بە زگماکی ڕقێکی قەبەو ئەستوورم لە زوڵمو زۆرو چەوساندنەوە لە باووباپیرانەوە بۆ بەجێ ماوەو هەر بەم پێودانگەشەوە بە لامەوە گەلێ گەلێ ئاسایی‌یە کە زوڵمکەرو زۆردارو چەوسێنەران ڕقیان لێم بێو کۆ لەوە نەکەنەوە کە کام دەردو سزاو ئەندێشە توندو تیژو سەختو لە رادەبەدەرە پێمی بنۆشن .
بـە هـەر حـاڵ من گیـانی کـابـرام ئـاخنی‌یـەوە نـاو تابووتەکەی‌و هەڵەکەی خۆمم سڕی‌یەوە . ئیتر ئێوەش خۆتانو خوای خۆتان .
(تاریکی)




# پۆستەی «کاروان»

● ئامادەکردنی : سۆران حەریری ●

خوێنەرانی ئازیزو هێژا ..

دیسانەوەو لە ژمارەیەکی تری گۆڤارەکەماندا ، ماوەی ئەوە بە خۆمان دەوەینەوە کە گەشتێکی تر بە نێو پۆستەی کارواندا ساز دەین و بکەوینەوە گفت و گۆیەکی برایانەو دڵسۆزانەی نامە شیرینەکانی ئێوەی ئازیزو خۆشەویست ..

بێگومان بەردەوامی ئێوەو بێن درێژیتان لە هاوکاری کردن لەگەڵ « کاروان » دا بواری ئەوەمان دەدا کە زوو زوو یەکو دوو بەسەر بکەینەوە ، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئەو بابەت و بەرهەمانەی بۆتان ناردووین هەڵیان بسەنگێنین و بە ووشەیەکی ناسک و ئامۆژگاری یەکی برایانە وەلامتان بدەینەوە ، تاوەکو لەوە ئاگادار بن و دڵنیابن کە هیچ بەرهەمێك پشت گوێ ناخرێ ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو ئەو نووسینانەی لە ئێوەوە پێمان دەگەن چۆن لای ئێوە ئازیزو بەنرخن لای ئێمەش هەر وان و شایانی خوێندنەوەو سەیرکردن و نرخاندنن ، هەڵبەتە زۆر جاری واش دەبێ کە هەندێ لەو بەرهەمانە لەبەر زۆر هۆی هونەری ، یا لەبەر لاوازی و تەواو پێنەگەیشتوویی ، وەیا لەبەر نەگونجانی لەگەڵ رەوت و رێبازی گۆڤارە کەماندا ناچار دەبین داوای لێبوردن لە خاوەنەکانیان بکەین و لە گۆشەی پۆستەی کارواندا ئاگاداریان بکەینەوە لەوەی کە بابەتەکانیان شیاوی بلاوکردنەوە نین ، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئێمە پڕ بە دڵ حەز دەکەین بەرهەمەکانیان زۆر لەوە بەهێزو پێزترین و چاکتر ئامانج بپێکن و قوڵتر بەرەو بنج و بنەوانی ئەدەب و رۆشنبیری کوردی رە گ داکوتن و بچنە خواری و گەرم و گوڕتر خزمەتی رێبازی پێشکەوتنخوازانەی کەلەپوورو رۆشنبیری کوردی بکەن ، کە ئەمانەش هەمووی لە ئەنجامی خۆماندووکردنێکی بێ سڵ کردنەوە بەدی دەهێنرێت و بە ئەنجام دەگەن ، هەربۆیەش لێرەدا ئەو ووتەیەمان دووبارە دەکەینەوەو دەڵێین : « خوێندنەوەی بەردەوام و خۆرۆشنبیرکردنی زانستیانە چاکترین بەرهەم و بە پێزترین نووسین دێننە کایەوە » . ئەو پێشنیارەشمان وەکو داواکاری یەکی برایانەو دڵسۆزانەیە بۆ هەموو ئەو خوشك و برایانەی ئارەزوو دەکەن بێنە مەیدانی نووسین و نووسینکاری و مەبەستیانە لەم رێگەیەوە خزمەتێکی گەڵ و نەتەوەکەیان بکەن .

دەبا ئیتر وەکو نووسەرێکی دڵسۆزو بە وەفا بیر بکەینەوەو ئەو کاتە بەنرخەمان بەشتی بە کەڵك و بە سوود بەسەر بەرین و تەنها مەبەستمان ئەوە نەبێت « زۆر بێت و بۆر بێت »

هەڵبەتە ئەمەیش جێگەی حەزو ئارەزووی زوربەی هەرە زۆری رۆشنبیرانی کورد نی یەو تەنانەت بەکارێکی بەنرخ و سوودمەندو پیرۆزیش لە قەڵەم نادرێت ..

ئێستاش روو لەو بەرهەمانە دەکەین کە لە ئەرشیفی پۆستەی کارواندا گیرساونەتەوەو ، وەلامی ئەو خوشك و برایانەمان دەدەینەوە کە نامەو بەرهەمەکانیان وا لەبەر دەستماندان و پێمان گەیوون ..

● بۆ ئەم براو خوشکە ئازیزو خۆشەویستانەمان کە شیعرو پەخشانیان بۆ ناردووین :

« سلیمان گەلالی ، کەمال ناکام ، محمد گردعازەبانی ، محمد جولا ناکویی ، شەیدا ، لوقمان عمر یاخی ، شەفیق رەنجاو ، محمد عبدالله ، فریدون مامە کەریم ، محمد عبدالكريم ، عدنان ئەتریشی ، کەوهێن رسول خدر ، ئەمین چاوڕەش ، مسعود حسێن بۆتانی ، عدنان گۆران ، محمد کاروانچی ، محمد کریم نانەوا ، نجیب عبدالمجید احمد ، فازیل پونگینەیی ، تەها خدر خۆشناو ، صالح یوسف کاکە حەمە ، فاخر خالد خۆشناو ، شوان عثمان عبدالله ، عبدالواحد أدريس ، عماد کمال عبدالرحمن ، توفیق ابراهیم ، رزگار سلیم ، عمر علی،پوشو خدر نادر ،

عبدالستار نائومێد ، لقمان قادر ڕەواندوزی ، نەوزاد بهاء الدین ، دارا حەمە شەریف حسێن ، خلیل احمد خۆشناو ، کوردستان بەختیار ابراهیم ، ابراهیم عثمان خۆشناو ، سعدالله بێبەش ، شیروان حسن حسنی ، رزگار اسماعیل ، سامي عبدالقادر ، سەعدی گوڵبەند ، هونەر محمد کریم ، فەرهاد شەیدا ، فاخر سیان شەپۆل ، شوکور قادر دەمێماتی ، پەروەر برایماغەیی ، سۆران خۆشناو ، ڕێبوار بەرزنجی ، هەڵمەت احمد بێبەش ، فؤاد پەروەر ، اردەلان حسۆ بابـان ، جمال محمـد شکور ، شاخەوان کـریم ، سالار غـریب ، سیروان قـەرەداخی ، ج . عبدالله خۆشناو ، فەرهاد خدر گۆمەشینی ، عبید خدر غەمبار ، ئازاد عبدالواحد ( قوتابی بەشی کوردی ) ، لطیف عثمان ئاسۆ ، مظفر شکر کاروان ، نەجات دلشێر ، عبدالرحمن علی عثمان ، جلال علی مصطفی ، عبدالعزیز پیرداود ، دڵبەند ، نەبەز کۆیی ، هۆشمەند ڕەواندوزی ، فرمان عزالدین ، عبدالصمـد سیان ، روناك حسن .

بـراو خوشکـە ئازیـزەکانم ، گـومان لەوە نـاکەین کـە نووسینەکانتان زادەی بیرو هەستێکی پـڕ لە خۆشـەویستیو دلسـۆزین ، ووشە نـاسکـو تـەڕەکـانی نێـو دێـڕی شیعـرو نووسراوەکانتان جوانترین پالپشتو هاندەری ئێمەن بۆ زیاتر بەرەوپێش بردنی ڕەوتی ڕۆژنامەگەری کوردیمـان لە پێناوی گـەشەپێـدانی ئەدەبو ڕۆشنبیـ.ـی کوردیو بـوژاندنـەوەو زینـدووکردنـەوەی کەلەپـوورو فـۆلکلۆری میللەتـەکـەمـانو پاراستنی .... مایەی شانازیمانە کەهەر خوشکێـك وەیا هـەر برایەك لە ئێوەوا بە گەرمیەوە دەستو بازووی مەردایەتیتان لێ هەڵ مالیوەو هەریەکە لە لای خۆتانەوە کەوتوونەتە نووسین ، شیعرو پەخشـانەکـانتان بـەو زمانـە تەڕو پـاراوەی کوردی دەهۆننەوەو بە تاسەوەن بیکەن بە دیاریـیـەکی خنجیلانـە بۆ خوێندەوارانی کورد .

ئـازیزانم لەگـەڵ ڕێزمـانـدا بـۆ ئـەو هـەمـوو ئـەرکو ماندووبوونەتان ؛ بۆ ئەو هەستە پاكو پـاراوەتان کـە مایـەی شانازی ئێمەیە ، بەلام وابزانم ئێمەش هەقی ئەوەمان هـەیە بلێین لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کە باسمان کردن ، مرۆڤ دەبێ زۆر بەتەنگ بەرزیو پڕ پێزیو تەڕو پاراویو پڕ سوودی ئەو بابەتە ئەدەبیەشەوە بێت کە دەینووسێتەوەو بۆ پاشە ڕۆژ وەکو نەخشی سەر بەردی لێدێتو بە نەمری دەمێنێتـەوە بۆ کـوڕو کـوڕەزا ، بەڵکـو لەوەش زیـاتـر ، ڕۆژگـارێـك دێت نـەوەی داهاتوومان کە پارچە شیعرێکی سەرکەتووی پـڕ لە هەستو سۆزی باو کو باپیـرانیان دەخـوێننەوە گـڕ بەردەبێتـە دڵو دەروونیانەوەو بۆیان دەبێتە هەوێنی ..

هەنگاونانی خێراتر بەرەو پێشەوەو زیاتر گەشەپێکردنی ئـەو ئەدەبو ڕۆشنبیـری‌یەی لەوانـەوە بـە دیـاری بـۆیـان ماوەتەوە .

خـۆشەویستـانم ؛ دەبا هـەریەکێ لە ئێمـە ئەم جـۆرە هـەستەی لەدلدا بێتو ئـەوەی دەینـووسێت وەکـو نـەخشی سەربەردەکەی لێبێت ، با بەر لەوەی کە شتێ دەنووسینەوە بیری لێبکەینەوەو بزانین تا چەند لێی سەردەکەوین بیر لەوە بکەینەوەو بزانین تا چ ڕادەیەك دەتوانین ئامانج بپێکین گـەر هاتوو بەردەوام بووین ؛ چ جۆرە ئامانجێك جێبەجێ دەکەین ، ئایا چەند هەنگاومـان لەو ڕێگا دوورو درێـژو سەختو پـڕ لە بەرپرسیاری‌یە بڕیووە کە بەرەو پیـری‌یەوە دەچـینو ئۆبـاڵی تـەواوکردنی لە ئـەستۆی هـەمووومـانەو هـەمـوویشمـان لە بەرامبەریا بەرەو ڕووی لێپرسینەوە دەبینەوە ..

دۆستانی ئازیز ؛ هەڵبـەتە هـەریەکێ لە ئێـوە بابـەتو بەرهەمەکەی خۆتان بەلاوە پەسندەو سەرکەوتووە ، بەلام ئێمە وەکو برایـەکی دلسۆزی ئێـوە لە لایەكو ، وەکـو دلسۆزێکی ئەدەبو ڕۆشنبیری‌ی کوردی لە لایەکی ترەوە داوای ئەوەتان لێدەکەین کە مرۆڤ چەند زیاتـر خۆی ڕۆشنبـیر بکات ئـەوە ئەوەندە چاکتر بەرهەمی بەپیتو بەفەڕ پێشکەش بە ئەرشیفی کتێبخانەی کوردیمان دەکات ، لەتەك ئەمەشدا دەبێ باوەڕمان بەوە هەبێت کە هەموو شاکـارێکی ئەدەبی نـەمریش هـەر لە ئـەنجامی شـەونخونیو هـەوڵدانو کـۆششی بێ پسـانـەوەو خۆماندووکردن هاتۆتە کایەوە ، هیوادارم ئێوەش وەکو شاعیرو پەخشان نووس زیاتر لەم ڕێبازە ئەدەبی‌یەی کە گرتووتانە نزیك ببنەوەو چاکتر بچنە بنجو بنەوانیەوە ، تاوەکـو بەری ڕەنجی هەموو لایەکمان ووشەیەکی هەمیشە زیندووی نەمر بێت ..

● **بۆ ئەم برا ئازیزانەمان :**

پوشو خدر نادر ، فازیل پونگینەیی ، مەریوان فرج محمد ، لە هەولێر ـ عمر علی نعمان ، لە زاخۆ لوقمان عمـر احمد ، لە کەرکووك .

ئێمه له کاتێکدا که زۆر سوپاسی هەستی پڕ له دڵسۆزیتان دەکەین بەرامبەر بە گۆڤارەکەمان ، له هەمان کاتدا داوای لێبوردن دەکەین که بۆمان نەکرا سوود لەو شیعرانەتان وەربگرین که بۆ ژمارە تایبەتی‌یەکەی « نەورۆزو ئادار » ناردبووتان ، ئەویش بە هۆی ئەوەی که درەنگ گەیشتنە دەستمان ، هیوادارین لەم هاوکاری‌یەتاندا بەردەوام بن‌و هەربژین .

● بۆ هەڵگری ئەم دوو نازناوە « ج . ج . ش ؛ ع . ش » و زۆر برادەری تر که ناوی خۆیان نانووسن .

ئێمه زۆر جاری تریش ئەوەمان ڕاگەیاندووە که هەر نووسەرێك بیەوێ شتێکمان بۆ بنێرێ دەبێ ناوو ناونیشانی تەواوی خۆی دیار بکات ، ئەویش لەبەر دوو هۆ ؛ یەکەمیان بڵاوکردنەوە له گۆڤارەکەماندا پاداشتی لەسەر وەردەگیرێ ، دووەم : وەکو باوە له هەموو دەزگایەکی ڕۆژنامەگەری‌یەکێ که بابەتێ دەنیرێ دەبێ ناوی تەواوی خۆی بەسەرەوە بنووسێت ، لەهەمان کاتدا بۆی هەیە ناوێکی تر که خۆی هەڵی دەبژێرێ وەیا نازناوێك دیاری بکات بۆ ئەوەی بابەتەکەی لەژێر ئەو ناوەدا بڵاو بکرێتەوە لەحاڵەتێکدا گەر نەیەوێ ناوە تەواوەکەی بڵاوبێتەوە بۆیە وا دووبارەی دەکەینەوە که لەمەودوا هیچ بابەت‌و بەرهەمێك بڵاو ناکەینەوە گەر هاتوو ناوی تەواوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبێت ، جا بابەتەکە هەرچەند چاك‌و سەرکەوتوویش بێت ..

● بۆ کاك هیوا ساڵەیی ، سوپاست دەکەین ئەمەش ئەو پارچە شیعرەیە که بۆت ناردبووین :

● بۆ نەشمیلێکی دوور ●

ئەی ئەو شۆخەی بۆ خاتر تۆ
خەوم بەشەو لێ زویرە
ئەی ئەو جوانەی له دووری تۆ
خەیاڵم لا بێ سنوورە
ئەی ئەو یارە نازەنینەی
ئەسووتێم بۆت وەکو کورە
ئاخۆ کەی ئەتوانم بمژم
ئەو جووتە سێوە لاسوورە

● بۆ کاك شەماڵ صابر محمد ،پیشەکی زۆر سوپاست دەکەین که وەکو نووسەرێکی دڵسۆز ویستووته له یادی دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیدا شتێ بکەیتە دیاری ، بەلام داوای لێبوردنت لێ دەکەین که بۆمان نەکرا له کاتی خۆیدا سوودی لێ وەربگرین لەبەر لاوازی بابەتەکەو ساکاری ناوەرۆکەکەی ، هیوادارین بەردەوام بیت‌و بەرهەمی بەکەڵك‌و بەسوود پێشکەش خوێندەوارانی کورد بکەیت ..

● بۆ برایێ هێژا لقمان یاسین یوسف ، سوپاس بۆتەو هیڤی دارین تو ل هاریکاریا خۆ نەکەڤی‌و هۆزانێت چێتر بۆمە فرێ کەی ، ئەڤەژی پارچەکە ل هۆزانا « سترانەك » یاکو تە بۆ خوێندەڤانا کری‌یە دیاری :

● سترانەك ●

تۆرینا من
دگەل تیشکا ڕۆژێ سپێدێ زوی
کانییێت کوڤلانا دەربوون
تێکەل بوون دگەل دەنگێ کەوێ
دبوونە سترانەکا خەمگین
ئەز دگریم
بو ڤی دلی تژی برین
ب وان تیرێت
سینگێ من کەلاشتی‌و بورین
ب وی دەردێ
ژارکرین دوو دلێت پڕ ئەڤین

● بۆ برای ئازیزمان کاك شێرزاد محمود سیدە ،دڵخۆشین بەوەی که برایەکی دڵسۆزی وەکوو تۆ هاوکاریمان لەگەڵدا دەکاو بەرهەم‌و نووسینمان بۆ دەنێری ، بەلام دەبێ بمان بووری که بابەتەکەتمان ـ « زاراوە ڕامیاری‌یەکان » بۆ بڵاو ناکرێتەوە ، چونکه له هەڵبژارد نیاندا سەرکەوتوو نەبوویت ، جگە لەوەی که ئەم جۆرە زاراوانە بەکتێب بە زمانی عەرەبی زۆر بڵاوبوونەتەوە ، هیوادارین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنووسیت ..

● بۆ كاك « مەهدی ئەحمەد » ؛ ببوورن كە گۆڤارەكەمان زیاتر ئەو بابەتانە بڵاو دەكاتەوە كە خۆماڵی بن ، جگە لەوەی كە نووسینەكەی بەڕێزتان شیعرێكە بە عەرەبی نووسراوەو تۆ كردووتە بە كوردی كە ئەمەیشیان هەردیسان ئەو تام و چێژەی نی یە كە بابەتی خۆماڵی هەیەتی چونكە شیعر جیاوازی یەكی زۆری هەیە لەگەڵ وەرگێرانی بەرهەمی تر ..

● بۆ كاك ئاری ڕەنجدەر ، سوپاست دەكەین بۆ ئەو دوو پارچە شیعرەی كە بۆت ناردووین وا ئەم پارچەیەمان لە یەكێكیان هەڵبژارد ، هیوادارین لەمەودوا بەرهەمی بە كەڵكترمان بۆ بنێری ..

● یادێكی شیرین ●

ئەی پەرستگای هەموو كاتم
كات ژمێری ، هەست و خۆزیام
چركە ؛ چركە ؛
بۆت لێ دەدات
هەر یادێكت بێتە میوان
لە گۆمی دڵ
ڕاوكەرێكی شەپۆلی خۆر ڕادەژێنێ ..

● بۆ برای ئازیزمان كاك بویا متی بهنان لە عینكاوە ، پڕ بە دڵ سوپاست دەكەین بۆ ئەو هەستە ناسكو پڕ لە دڵسۆزیەت كە بەرامبەر بە گۆڤارەكەمان دەرت بڕیوە ، هیوادارین هەمیشە شادو بەختەوەر بیت ، كاكی برا ئەو نەخشەی بەرگە كە بۆ كاروانت ناردبوو لەبەر زۆر هۆی هونەری نەمانتوانی سوودی لێ وەبگرین ، ئاواتە خوازین لەم بوارەدا زیاتر خۆت ماندوو بكەیت و هەربژیت .

● بۆ خوشكە « لاجان ڕەواندزی » ، خوشكی ئازیز ئێمە زۆر سوپاست دەكەین و هیوای ئەوە دەخوازین كە خوشكانمان گورجتر دەست دەنە قەڵەم و چاكتر بچنە بنج و بناوانی ئەو كێشەو گرفتە كۆمەڵایەتیانەی كە ئافرەتی كورد ڕوو بە ڕووی دەبێتەوەو ، دەستنیشانی ئەو هەڵ و مەرجانە بكەن ، كە ڕێگە لەبەردەم چارەسەری ئەو بارە ئاڵۆزانەدا تەخت دەكات ، لە هەڵبژاردنی ناونیشانی نووسینەكەتدا مرۆڤ و هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی » تا رادەیەكی چاك سەركەوتوویت بەڵام نەتتوانیوە بە وردی ناوەرۆكەكەی شی بكەیتەوە ، جگە لەوەی كە بابەتەكە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ و هی ئەوەیە چاكتر لێی بكۆڵرێتەوە ، هیوادارین بەرهەمی ترمان بۆ بنێریت و سوپاست دەكەین .

● بۆ كاك دڵژان زەندی لە كەركووك ، سوپاس بۆ هاوكاری برایانەتان ، وا ئەم پارچە شیعرەمان لە شیعری « شەپۆلە چرپە » هەڵبژاردو پێشكەشی خوێنەرانی دەكەین ، ئاواتە خوازین بەرهەمی چاكترمان بۆ بنێری :

ئازیز .. تۆبی و خوا ، ..
لە دەنگی هاژەی هەڵچووی
ئەو شەپۆلە چرپانە ، وەرەس مەبە ،
كە كۆرپە خەمەكانی ناخت ڕا ئەژێنن ، ..
ئەوە هەموو عەشق و !
خۆشەویستی گیانی منە .
ئەیانەوێ عەشقی باڵای تەمەنت ،
لە ڕووباری هەتاوا بشۆنەوە ...

● بۆ ئەم خوشكو برا نووسەرانەی كە ئەم بەرهەمو نووسینانەیان بۆ ناردووین ؛ « گوڵ و ژیان ، شاجوانی دەربەند فەقەرە ، سێ لاپەڕە لە ئەفسانەی پەری و خەڵوەت نشینەكە ، تابلۆیەكی شاری بۆكان ، ژن و مێردێك و ئەم دەمەتەقێیە ، ڕژیانا گەشترین ستێرا ئاسمانێ ، فەقیێ تەیران ، بزافەك بۆ ئێك گرتنا زمانێ كوردی ، ناڵەی دووری چیا ، قسەی نەستەق ، گڵكۆی تازەی لەیل ، مزگێنی لە نەورۆزا ، قوتابخانەكان و كۆبوونەوەی باوكان و دایكان ، سبنسەری فەیلەسوف و ئەفسانەیەكی كوردی؛ئێمە لە كاتێكدا خۆشحاڵین بەو پاڵپشتی كردنەی ئێوەی ئازیزو بەڕێز بەڵام لەهەمان كاتدا دەبێ ببوورن كە ئەو بەرهەمو نووسینانەتان لەزۆر ڕووی هونەری و دارشتن و ناوەرۆكەوە لاوازبوون ، بەڵكو زۆربەیان زیاتر لە جارێك و دووان و سییان و زۆر لەوەش قوڵ و فراوانتر كە ئێوە لە بارەیانتان نووسیووە ، لە ڕۆژنامەو گۆڤارە

کوردی‌یەکان‌دا بەسەرکراونەتەوە ، ئەمە جگە لەوەی کە پەلەکردن‌و سادەیی‌و هەڵچوونیش بە هەندێ بەرهەمەوە دیارە ، هیوادارین لەمەودوا شتی چاکترو بەکەڵکترمان بۆ بنێرن تاوەکو ئێمەیش سوودی لێ وەربگرین‌و لە گۆڤارەکەماندا بڵاویان بکەینەوە ..

● **بۆ کاك ابراهیم عثمان رشید ، خالد کاوێس ، ازاد حمدامین یونس** : ببوورن کە بەرهەمەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، چونکە ئێمە زیاتر بەرهەمی خۆماڵی پەسند دەکەین‌و بڵاوی دەکەینەوە ، جگە لەوەی کە بابەتە وەرگێردراوەکانی ئێوە سوودێکی ئەوتۆ نادەن بە دەستەوە کە خوێندەواری کورد سوودی لێ وەربگرێ‌و سوپاستان دەکەین ..

● **بۆ نووسەرانی ئەم بەرهەمانە** ؛ « ژ ئەڤرو پێڤە ، رزگاری ، دارستان » سوپاستان دەکەین‌و بمان‌بوورن کە دەڵێین نووسینەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون‌و ، بە هیوای بەرهەمی چاکترو بەپێزترتانین ..

● **بۆ کاك « سیف الدین ناسق حسن‌و لقمان عمر احمد »** ، ببوورن کە بۆمان نەکرا ئەو دوو بەرهەمەی ئێوە بۆتان ناردووین بڵاوی بکەینەوە لەبەر ئەوەی هەردوو بابەتەکە زۆر سادەو ساکارن‌و زۆر مەرجی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی‌و زانستی‌یان تیادا بەدی ناکرێ جگە لەوەی کە باسێکیان لەسەر شاعیرێکی لاوە کە لای زۆربەی هەرە زۆری خوێنەرانەوە نەناسراوەو خاوەنی تاقیکردنەوەیەکی ئەدەبی وانی‌یە کە بەم شێوازە لە بارەیەوە بنووسرێتەوە ، هیوادارین لەمەودا زیاتر خۆتان ماندوو بکەن‌و شتی بەکەڵکتر هەڵبژێرن کە شیاوی بڵاوکردنەوە بێت ..

● **بۆ نووسەری ئەم دوو چیرۆکە « دەردە سەری ، شێت خولیایی »** ، سوپاستان دەکەین‌و ببوورن کە چیرۆکەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ..

● **بۆ ئەو برا خۆشەویستانەمان کە ئەم بەرهەمە فۆلکلۆریانەیان بۆ ناردووین** : « چاکەی سەربەخۆ سەری ساحێبی دەخوا ، میرێ من هەلز فری ، های بێ‌زارێ ، بەیتی دلداری ، بەیتی نازدارو نازدارو چەند بەیتێکی تر » پێشەکی دەڵێین مایەی بەختەوەریمانە کە ئێوەی براو دڵسۆزمان بەو گەرمیەوە بە دەنگمانەوەدێن‌و بەردەوام لە نووسینەکانتان بێ بەشمان ناکەن بەلام بۆ ئەوەی گۆڤارەکەمان ، گۆڤاری هەموو نووسەرو رۆشنبیرێك ، لەم رەوتە بەرەو پێش‌چووەی خۆی دوا نەکەوێ ، بۆیە داوای لێبووردن لە ئێوەی ئازیز دەکەین کە ئەم بەرهەمانەتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ئەویش لەبەر ئەوەی بەشێکی هەرە زۆریان لە رۆژنامەو گۆڤارو کتێبە فۆلکۆریەکاندا بڵاوبوونەتەوەو دووبارە کردنەوەیشیان بە پەسند نازانرێ ، جگە لەوەی هەندێکیشی زیاتر لە پەندی پێشینان دەکات‌و لەبەشێکیشیاندا پەنجە بۆ ئەو سەرچاوەیە نەکێشراوە کە بەیتەکەی لێ وەرگیراوە .. هیوادارین لەمەودوا بە بەرهەم‌و ، بابەتی چاکتر هاوکاریمان لەگەڵدا بکەن‌و هەربژین ..

● **بۆ ئەم دوو برایەمان ، سامی سلێمان حاجی لە دهۆك ، طاهر عثمان محمد لە هەولێر ،**

**پڕ بەدڵ سوو‌پاستان دەکەین بۆ ئەو ئەرکەی بەجێتان هێناوە لە بواری وەرگێڕانی بەرهەم‌و نووسینی کوردی بۆ زمانی عەرەبی ، بۆ ئەوەی برا عەرەبەکانیشمان تا رادەیەك ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردیماندا پەیدا بکەن ، بەلام بۆ ئەوەی ئاشنایەتی‌یەکە بە قولی رەگی خۆی داکوتێ ، دەبێ ئەو زمانەی بابەتەکەی پێ دەنووسرێتەوە وەیا بۆی وەردەگێڕدرێ زۆر مەرجی هونەری‌و تەڕو پاراوی تیادا بەدی بکرێ‌و دووربێت لە کەم‌و کورتی داڕشتن‌و زمانەوانی‌یەوە ، هەربۆیەشە داوای لێبوردنتان لێ دەکەین کە ئەو بابەتانەی بۆتان ناردبووین شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، بە ئاواتی ئەوەین کە بەرهەمی داهاتووتان بەسوودتر بێت‌و چاکتر ئامانج بپێکێ ..**

● **لە کۆتایی گەشتی پۆستەی ئەمجارەماندا سوو‌پاسێکی گەرمی کاك عبدالحسین سید ابراهیم دەکەین لە بریتی ئەو دیاری‌یە خنجیلانەی کە بۆ گۆڤارەکەمانی ناردووە هیوادارین وێنەی ئەم برایەمان هەر زۆربن ..**

**ئیتر تا نامەیەکی ترو تا گەشتێکی دیکەی گۆڤارەکەمان هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین‌و هەرشادو سەرفراز بن‌و هەربژین ..**

# کاروانی رۆشنبیری لەکوردستاندا

## لە هەولێر

ئامادەکردنی : شوان



« ئێوارە کۆڕێك »

### ئێوارە کۆڕێك بۆ مێژوی موسیقا

لە چوارچێوەی چالاکیِ هونەریەکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە هەولێر ئێوارە کۆڕێکی خنجیلانە بۆ هونەرمەند لوقمان بابا رەسول بەرزنجی سازکرا ، شایانی باسە زۆربەی دۆست و شەیدایانی هونەری موسیقا ئامادەی کۆڕەکە بوون .

### ژیانی لوقمان

لوقمان بابا رەسول بەرزنجی ، لەشاری هەولێرو لە ساڵی 1955 هاتۆتە دنیاوە ، هەر لە سەرەتای ژیانی قوتابیەتیە وە لە قوتانجانەی سەرەتاییەوە هۆگری موسیقا بووە ، تا لە پلەی خوێندنی ناوەندیدا وەك ئاشقێك مامەلەی لەگەڵدا کردوەو بەشداری چالاکی هونەری مۆسیقای کردوە . لە سەرەتای ساڵی 1978 ئەندامی تیپی هونەری هەولێرەو مامەلە لە گەڵ ئامێری ( ئۆکۆردیون ) دا ئەکات و لەم ماموستایانەوە شارەزای دنیای ئەم هونەرە گەورەو بەچێژە بووە :

ماموستایان : عبدالواحد مەرجان ، رزگار خۆشناو ، ئەلبێرت عیسیٰ و گەلێکی تر .

لە مەیدانی تاقیکردنەوەی هونەری ئاواز دانان و چالاکی نواندن لەم بوارە ناسکەدا ، تائێستا چوار پارچە ئاوازی مۆسیقاو یەك ئاوازی گۆرانی داناوەو پارچە مۆسیقاکان بەم ناوانەوەن :

1 — مۆسیقای (لاوەند) کە بڵاوکراوەتەوە ،
2 — مۆسیقای (بووکێنی) تۆمار کراوەو ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە .
3 — مۆسیقای (خەنەبەندان) تۆمارکراوەو ئامادەیە کە بەم زوانە بڵاوکرێتەوە ، ئەم پارچە مۆسیقایە بە دوو ئامێر [ ئۆکۆردین و پیانۆ ] هێنراوەتە بەرهەم .
4 — مۆسیقای (شەمال) : لەبەر دەستایەوە بۆ تۆمارکردن ئامادە کراوە .

### ( زەرد کەفتی موحازەرەکە )

کاك لوقمان لە سەرەتای باسەکەیدا بە شێوەیەکی وردو چڕوپڕ لە بارەی بایەخدانی مرۆڤەوە بە مۆسیقاو هونەری مۆسیقا دوا ، هەروەها پەنجەی بۆ ئەولایەنە برد کە چۆن مۆسیقا لەژیانی مرۆڤدا ڕۆڵی پڕ بایەخ و کاریگەریتی خۆی بینوەو ئیسپاتی بوونی خۆی کردوە .

هەردوا بە دوای ئەو کورتە باسەی هاتە سەر چۆنیەتی سەرهەڵدان و پەرەپێدانی هونەری مۆسیقای لە ولاتە پێشکەوتووەکانداو پێ بە پێ ئەو قۆناغە جیا جیایەی پیدا تێپەڕیوە دەست نیشانی ئاستی پلەی گەشەکردن و نەش و نمای کرد .

هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو قوناغانەدا پلەکانی بەپێ چەرخە مێژوییەکان دەست نیشان کردو بۆشایەتی ڕاستی بۆ چوونەکانی نموونەی موسیقایی ئەو سەردەمانەی هێنایەوە .

## مێژووی مۆسیقا یان مۆسیقا لەدەلاقەی مێژووەوە .

شایانی باسە کاك لوقمان لە موحازەرەکەیدا بە شێوەیەکی قوول باسی مێژووی مۆسێقای کرد لە دەلاقەی مێژوە وە ، هەر لەبەر ئەوە بوو بایەخێکی تەواوی بەسەر هەڵدانی مێژوی مۆسیقادابوو لە سەردەمەکانی ژیانی مرۆڤەوە تا دەگاتە سەردەمی پەیدا بوونی ئیسلام . باسەکە خۆی لەخۆیدا شێوەی چۆنیەتی بەراورد کردنی مۆسیقای لەوسەر دەمانەدا لە ئامێز گرتبوو کە مرۆڤ بە ئاسانی ئەو ساتانەی بۆ دەر دەکەوت کە بە قوناغی شکۆفەداری مۆسیقا دادەنرێ .

موحازیر دوای ئەو باسەی سەبارەت مێژوی مۆسیقا لە وولاتەکانی دوورو نزیك پێشکەش کرد ، لەمەر ئاوازو مۆسیقای خۆمالیش دواو لەبەر رۆشنایی شارەزایی و مامەلە کردنی رۆژانەی لەگەڵ ئەم هونەرەدا تیشکی بیرو راو سەرنجی وردی خۆی دەرخست .

### ( لوقمان و مەرجەکانی ئاواز دانان )

بەلای هونەرمەند لوقمانەوە گرنگترین مەرجەکانی ئاوازدانان لەم بەشانەدا خۆی دەنوێنێ :

**1 – جۆرو چۆنیەتی ئاوازی مۆسیقا .**
**2 – جۆرو چۆنیەتی گۆرانی‌یەکە چ وەك وشە یان فۆنێتکی زمان .**

**موحازیر پێ‌وایە کە دەبێت سەرچاوەی ئاوازی مۆسیقا مۆرکی نەتەوایەتی بەتێری تێدا رەنگ بداتەوەو دووربێت لە کاریگەرێتی ئاوازی بێگانەوە .**
**بەلام سەبارەت بە ئاوازی گۆرانی‌یەوە دەڵێ بەم شێوەیەیە :**
**أ – ئاوازدانەر دەبێت لە ناو چینی کۆمەڵدا بژی‌و جۆری ئاوازەکە لەگەڵ زەوقی کۆمەڵدا بگونجێ‌و لەهەمان ساتیشدا مۆرکی رەسەنایەتی خۆی پێوە دیاربێت .**
**ب – باشوایە دەنگی گۆرانی بێژ لەگەڵ ئاوازەکەو ئامێرەکاندا بگونجێ .**
**ج – دەبێت ئەو تێبینی‌یە بەباشی رەچاو بکرێت کە وشەو هونراوەکە لەگەڵ ئاوازەکەدا بگونجێ .**
**ء – دەبێت ئەو لایەنە گرنگە رەچاو بکرێت کە : ئەو ئاوازە بۆ پلەو قوناغێکی دیاری‌کراوە یان هەتا هەتا دەبێتە سەر ویردی سەر زمانی خەلکی .**

### ( کۆرەکەو جۆری هەڵبژاردنی بابەتەکە )

لە چاو پێکەوتنێکی تایبەتیدا کاك لوقمان ئەو لایەنەی روون کردەوە ؛ کەبۆچی کۆرەکەی بەناونیشانی کورتە باسێك لەسەر مێژووی مۆسیقا پێشکەش کردو ووتی :

... ئەوەی راستی بێت هەموو نەتەوەیەك بە تاقیکردنەوەو ئاوردانەوە ؛ توانیویەتی پلەیەك لەپێشکەوتن بەدەست بهێنێ ، جالێرەدا ئەم باسە وەکو ئاوردا نەوەیەك بوو لە مێژووی مۆسیقا .

هۆی هەڵبژاردنیشم ئەوەبوو چوونکە مۆسیقا هەر ئامێر نی‌یە یاخود ئاوازدانان ، بۆیە دەبێت ئاوردانەوەشی لەگەڵدا بێت .

هەر لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونەشمە هیوادارم هەموو هونەرمەندو هونەر دۆستێك هەوڵی ئەوە بدات کە ئاست و پلەی هونەری مۆسیقاکەمان بێ بە پێی پێشکەوتنی زانست و شارستانی‌یەت هەنگاو بنێت .

بەلای خودی خۆمەوە ئەو موحازەرەیەم لەکەم و کورتی خالی نی‌یە ، بەلام پێم‌وایە هەنگاوێکی سەرەتایی بەکەڵك بێت و بە هاندەرێکی بەهێزی دادەنێم کە پالم پێوەبنێت زیاترو روونترو چاکتر لەسەر مۆسیقا بنووسم ، هەر لەبەر ئەوەشە بەسنگێکی فراوانەوە پێشوازی لە هەموو پێشنیازو رەخنەیەکی بنیات نەر ئەکەم ، بەمەرجی لەپێناوی گەشەکردن و پەرەپێدانێکی دڵسۆزانەبێت بۆ هونەری مۆسیقای نەتەوەکەمان

### ( پرسیارێکی ئاسایی‌و ئاواتێکی مەزن )

لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا هونەرمەند لوقمان لە دەلاقەی ئەم پرسیارەوە کە ئایا مۆسیقای کوردی لە چ پلەیەکدایەو ئەرکی سەرشانی هونەرمەندانی ئەم بوارە چی‌یە ؟
.. ئاواتە خوازی خۆی دەربری کە هیوادارە هونەری مۆسیقای

کوردی لەسای سەری هونەرمەندەکان‌و هەوڵ‌و تەقەلای دڵسوزانەیانەوە دوا رۆژێکی رووناک‌و بەرز مسۆگەر بکات .

## ( زەوقی موسیقی‌و ئامادەبوانی کۆڕە )

شایانی‌باسە لە کۆڕەکەی هونەرمەند لوقماندا سەرەرای کۆمەڵی هونەرمەند جەماوەرێکی دوست بە موسیقاو ئاوازی کوردی ئامادە بوون کە پاش کوتایی هاتنی موحازەرەکە گەلێ بیروراو بۆ چوونی بەکەڵك سەبارەت پەل‌و پۆیی بابەتی موحازەرەکە دەربراو بەسەرکەوتووی کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا .

## « پێشانگایەکی هونەری »

راستیان ووتوە کە کورد نەتەوەیەکە ئاشق‌و شەیدای هونەرە ، دیارە دەبێت ئەو بۆچوونە بێ بنەما نەبێت‌و لە خۆوە نەگوتراوە ، تاقیکردنەوەیەکی یەکجار دوورو سەخت ئەو راستی‌یەی سەلماندوە .

دیمەنی رەنگین‌و سروشتی دڵفرێنی خاکی کوردستان‌و زەوق‌و سەلیقەی هونەروەری مرۆڤی کورد بەهرەیەکی خورسکی پێ بەخشیوە ... بۆیە هەر روو لە هونەرمەندێك دەکەین لەگەڵ بواری هونەریدا خاوەنی بەهرەیەکی گەش‌و دەستەلاتێکی بالایە ... هونەرمەند عەبدو لواحد مەرجانیش یەکێکە لەو مرۆڤە بەتوانایەی لە بواری هونەری مۆسیقاژەنی پەیکەرتاشین ، تابلۆ نەخشاندن‌و ئەکتەرێکی لێ هاتوو دەرکەوتوە . لە رۆژی 7/25 و بۆ ماوەی (10) رۆژ پێشانگایەکی قەشەنگی لە هۆڵی بەریوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر لە



هەولێر کردەوە . لەوپێشانگایەدا (34) تابلۆی هونەری‌و (13) کاری پەیکەر تاشی پێشکەش کرد .

## ـ کانی بەهرەی هونەرمەند ـ

هیچ هونەرمەندێك خاوەنی بەرهەمێکی راستەقینەی رەسەن نابێت گەر هۆیەکی کاریگەری بەهێز هەست‌و سەلیقەی ئەورژێنێ‌و هاندەرو پاڵ پێوەنەرێکی بەهێزی نەبێ ... تابلۆکانی هونەرمەند عەبدوالواحد مەرجان لە سروشتی کوردستانەوە ئیلهامی وەرگرتوەو بەسەر بەشێکی زۆری تابلۆکانیدا رەنگی داوەتەوە . تابلۆی : [ گوندەکەمان ، باخەکانی شەقلاوە چیای سەفین ، خۆرهەلاتن لە دەلاقەی درەختەکانەوە ] نمونەی ئەو بابەتەن کە چوون دەست‌و پەنجەی هونەرمەندانەی هونەرمەند نەخشاندونی ، ئەو تابلۆیانە نیشانەی ئەشق‌و خۆشەویستی چیاو رووبارو درەخت‌و خۆری وولات دەردەخات .. بەڵگەی خۆبەستنەوەیە بە خاك‌و خۆڵ‌و دارو بەردی نیشتمانی دایکەوە

هونەرمەند مەرجان نەهاتووە ، وێنەیەکی سست‌و بێ‌دەنگی چیاو دوڵ‌و بێ‌دەشتی کوردستان بگوێزێتەوە سەر تەختەی تابلۆکانی ، بەڵکو لەبەشێکی هەرە زۆری تابلۆکانیدا ژیانی مرۆڤی کورد دەردەخات ... ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری ، لە گوندا لە ساتی کۆچدا ، لەچیادا ، لە بێ‌دەشتا ... تابلۆکانی [ دایکم ، کچە باخەوانێك ، شوانێك ، کانی ژنان ] بەڵگەن بۆ ئەوەی هونەرمەند لایەنی زیندویتی ناو تابلۆکانی فەرامۆش نەکردوە ... لە تابلۆی کچە باخەوانێکدا مرۆڤ هەست دەکات رووە باخچەیەك مل دەنێت‌و خاوەن باخچە کچێکی شۆخ‌و شەنگە ، بەوپەری سەربەستی‌یەوە سەبەتەیەك میوەی رنیوەو پێشوازی میوانەکەی دەکات‌و بەرەوپیری دێت .. مرۆڤ بەو دیمەنە گەشکە دەیگرێت‌و گەلێ سیماو مۆرکی خۆماڵێتی تیا بەدی دەکات .. تابلۆی دایکم چۆن دەبینم ؟ تێگرای هۆشی مرۆڤ ئەهەژێنێ‌و خۆشەویستی‌و گیانی وەفاری‌و گەورەیی دایك دەردەخات ... تابلۆی شوانە .. ژیانی ئاسایی‌و ساکاری مرۆڤی کورد دەردەخات کەچۆن بەپەنجەی بارێك‌و لێوی تەنکی فوو بە گەروی شمشاڵەکەیدا دەکات‌و لەسای دیمەنی

خاکەکەیدا ئاوازی خۆش و بەچێژ دەڵێ . تابلۆکانی هونەرمەند هەربەوەوە نەوەستاوە ، بەڵکو پەنای بردۆتە بەر ئیلهام وەرگرتن لە لایەنی فولکلۆری کوردی و وەك سەرچاوەیەکی ڕەسەن و بەهێز مامەڵەی لەگەڵدا کردوەو بە تیرێ دوو نیشانەی پێکاوە لەلایەك زیندو کردنەوەی ئەو لایەنە کەلتووریانەی مەرگ دەستی ناوەتە بینە قاقای و لەلایەکی دیشەوە تواناو بەهرەی هونەرمەندانەی خۆی تیا نواندون .

شایانی باسە ئەم پێشانگایە بە یەکێ لە هەرە پێشانگا هونەریە مەزنەکاندا دەنرێت و بە درێژای ماوەی پێشانگاکە دەستەدەستە هونەرمەندو هونەر دوستان ڕوویان تێ دەکردو لە دەفتەری سەرنج دەربڕنیدا پێخۆشحالی و تێنبیی و باری سەرنجیان دەردەبڕی و جێ ڕەزامەندیان بوو .

●



# لەسلێمانی

●

ئاسۆس : ئامادەی کردووە

●

**عەزیز نەسین میوانی سلێمانی بوو :**

ئێوارەی 1983/6/25 لەسەعات پێنج و نیوی پاش نیوەڕۆدا لەسەر شانۆی سانەوی سەلاحەدین ، پەردە لادراو نووسەری بە ناوبانگی تورك عەزیز نەسین هاتە پێشەوەو ووتی :

«بایان لەر ، بای لەر . ئی ی ئەکشام لەر بو گوزەل موناسەبەتە چوك مەسوود ئولدم ، کي شەهرينزن تياترو جولەريلە بولۆشتم ، ڤەشەهريمنم هەکندە کونوشمە فرسەتنی بولدم . گەر چەکتەن ...

ئەمجا خەڵکەکە بۆیان دەرکەوت کە ئەمە هونەرمەند کەمال سابیر بوو دەوری نووسەری دەبینی و دەیەویست بڵێ : خوشکان ، برایان ، ئەمشەو بەم بۆنە جوانەوە زۆر بەختیارم کە دەربارەی شارەکەم بدوێم ، لەڕاستیدا ...

پێش ئەوەی لەسەر ووشەکانی بەردەوام بێ هونەرمەند ئازاد محمد بچکۆل بێ ی بڕی و کەوتنە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی شار .

هونەرمەندی دوور وولات سمکۆ ناکام کۆمەڵێ کورتە چیرۆکی عەزیز نەسینی بۆ شانۆ ئامادە کردبوو .

هونەرمەند عوسمان چێوار دەرهێنەری بوو ، ئەندامانی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی بۆ ماوەی (35) ڕۆژ لەسەر شانۆ بەناوی (مرۆڤ و شارەکەی) پێشکەشیان کرد .

کورتە چیرۆکەکان بریتی بوون لە گیرو گرفتی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری بە شێوەیەکی باش مۆنتاژ کرابوون . زۆربەیان لەو چیرۆکە سەرکەوتوانە بوون کە بۆ شانۆ دەستیان دەدا ، تاك و تەرایەکیان نەبێ کە لە مەسەلە سەرەکییەکە دوور ئەکەوتەوە ، وەك (هاتنی شەرلۆك هولمز) بۆ یەکێك لە ئۆتێلەکانی ئەو شارە .

یەکێ لەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشەرانە ئەوەبوو کە پاسێك

بەرێگایەکی دوورا دەڕۆیشت .

دەستەیە رێگر رایان وەستاندو کەوتنە رووت کردنەوەیان ، بەلام کە زانییان «یەکێ لە ریبوارەکان» نووسەرەو گیرفانیشی بەتاڵە ئەوان شتێ پارەیان دایە ...

یان بەتالی و بێ هۆشی یەکێ لە بورژوا دەست رویشتوەکان کە پیاوێك ڕائەگرێ هەر بۆ ئەوەی دروکانی پەسند بکات کە لێی پرسی : ئایا شووشەیەك ئاو ئەتوانێ ئەم ژوورە تەڕ بکات ؟ ، بلێ : بەلێ تەڕی ئەکات ... نووسەرە بەسزمانەکە بەم تەلەیەوە بوو ، ئەوەندەی ووت : تەڕی ئەکات ، تا وای لێهاتبوو بەدەم خەویشەوە هەر ئەیوت : تەڕی ئەکات تا ڕۆژێ گەیشتە تینی و یاخی بوو ، پڕ بەو ژوورە قیژاندی : نەخێر تەڕی ناکات .

ئەمجارەش بەبێ ئیشی کەوتەوە سەر شەقامەکان .

هونەرمەند عوسمان چێوار دەرهێنەری ئەم شانۆنامەیە دەلێ :

وەك شەوانی رابوردوو
وەك شەوانی داهاتوو
ئێمەی ئەکتەر
گیان ئەکەینە بەری مردوو
دنیا تێك ئەدەین سەراسەر
ئە یخولقێنینەوە زوو
چەپلە مەکوتن
گوێچکەی بیستن
زەینی فێربوون و کارکردن
بکەنە بەر
ئێمەی ئەکتەر

ئەو هونەرمەندانەی لەم بەرهەمە هونەرییەدا بەشداربوون ئەم بەڕێزانە بوون :

کەمال سابیر ، ئازاد محمد بچکۆل ، مصطفى احمد ، ابراهیم چێوار ، سروه عزت ، گولالە جلال ، سیروان جمال ، ئاکۆ عزیز ، ئارام محمد بچکۆل ، رزگار عبدالله ، نەوزاد باراوی ، ئاراس محمد امین ، نهرۆ صالح ، مهدي مجید ، جەبار مەعروف ، یاسین قادر ، جەمیل ئەحمەد ، تاهیر باراوی ، ئاسۆس غەفوور .

جل و بەرگ و ئێکسسوار زۆر ڕێك و پێك بوو .

کاك مستەفا بەخۆی و بە یەلەکەکەیەوە وات دەزانی دەمێکە شوفێری ئۆتوبانە لە نێوان ئەنقەرەو قۆنیەدا .

دیکۆریش سادەو پڕ بە پێستی دیمەنەکان بوون ، بەهۆی ئەو تابلۆیانەوە کە بە ئاسانی دەگۆڕران .

ئەوەی شیاوی باسە ئەو کورتە چیرۆکانەی کە عەزیز نەسین خۆی تێیاندا ژیابوو ، لەوانەی تر سەرکەوتوو ترو سەرنج ڕاکێشەرتر بوون . پیرۆزبایمان بۆ تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی . هیوامان وایە لەسەر پێشکەش کردنی بەرهەمی سەرکەوتوو بەردەوام بن .

●

## پیشانگای هاوبەشی

## حەوت هونەرمەندی لاو

لە 8/6 تا 1983/8/14 ئاراس عبدالکریم و ئازا حسیب قەرەداخی و حەمە سەعید باپیرو خالید رەسول و عبدالکریم رشیدو عمر رسول و نەهرۆ شەوقی لە هۆلی مۆزەخانەی سلێمانی پیشانگایەکی هاوبەشییان پێشکەش کرد ، لە تابلۆکانیانا خۆشەویستی خاك و بۆ هونەر سووتاندن کۆی کردبوونەوە دەربارەی ئەم پیشانگایە هونەرمەند قادر میرخان دەلێ :

«بۆ شارەزا بوون لە سروشتی کارێکی هونەری ، دەبێ ڕاستەوخۆ بچینە ئامێزی تاقیکرونەوەکان خۆیانەوەو لێیان تێ بگەین . جگە لە داهێنان پیشاندانی بەرهەمەکەش بە خەلکە ، لە خۆیدا تاقیکردنەوەیەکی ترە ، هونەرمەندی پێدا تێدەپەڕێ ، هەلبژاردنی شوێنی پیشاندان ، کات ، شێوەی پیشاندان ، ئەو بەرهەمانەی دی کە لە گەلیدا پیشان دەدرێن .. تا ... د . ئەمانە هەمووی کەرەسەی ئەزموونی بەرەو ڕووبوونەوەی بەرهەمەکەن لەگەل خەلکیدا .

ئەو هونەرمەندانەی بەرهەم پیشان دەدەن کۆمەلێ لاوی هاو تەمەنن ، هیچ کامیان خوێندنی هونەرییان تەواو نەکردووە ، ئەم پیشانگایە کۆی کردوونەتەوە لەگەل جیاوازی شێوازو بیریاندا . لە پیشانگاکانی لەمەودوایاندا چاوەڕێی نەك هەر ئەمانە بەلکو زیاتریشین» .

## ● هونەرمەندەکان ●

ئاراس عبدالکریم :

* ساڵی 1961 لە سلێمانی لەدایك بووە .
* ساڵی 1977 بەشداریی پیشانگای گەڕۆکی لاوانی لە سلێمانیو هەولێرو دهۆك کردووە .
* ساڵی 1978 یەکەم پیشانگای خۆی کردۆتەوە .
* ساڵی 1979 لە پیشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلێمانیدا بەشدار بووە .
* ساڵی 1982 دووەم پیشانگای خۆی پیشان داوە .
* لەم پیشانگەیەدا بە [5] تابلۆ بەشداریی کردووە .

ئازار ، ووردبوونەوە ، یەککرتن ، ژیانەوە ، تێڕوانین ، ئەمەی دواییان بریتییە لە شێوەی چوار ڕوو .

کاك ئاراس دەربارەی کاری هونەرمەندان لەسەر تابلۆکانی ووتی :

«دەتوانم بڵێم کە هونەرمەند بە تەماشاکردنی هەموو کارێکی هونەری سوودێکی گەورە دەبینێ ، جا لەهەر لایەنێکی هونەرییەوە بێت : ڕەنگ ، پێکهێنان ، شێوەکان ، لەبەر ئەوە بەلای منەوە هەموو هونەرمەندێك جیهاني بێت یان کورد هەر بەکەیان جۆرە کارتێکردنێکی تایبەتییان لەسەر ڕێبازە هونەرییەکەمدا هەیە .» ووتی لە تابلۆکانما زیاتر کارە هونەرییەکە

لە وەلامی پرسیارێکی تر مانا کاك ئاراس خۆی دەدوێتو ئەوە پیشان دەدات کە دەمەوێ دنیای سادەییو ڕوونی منالی بەواتای ڕەنگو شێوە دارشتنەوە بخەمە بەرچاوی مرۆڤی ئەمڕۆ کە ئەم سادەییەی تێدا مردووە ، لە لایەکی ترەوە ڕاستگۆییو هەروەها ووردکردنەوەی شێوەکان بە جۆرێك کە بەشە ووردیلەو سەرەتاییەکان بە دیار بخەم لە شێوە بەرچاوییەکاندا» .

ئازا حەسیب قەرەداخی :

* ساڵی 1960 لە سلێمانی لەدایك بووە .
* لە خێزانێکدا گەورە بووە کە هاوڕێی خۆ شەویستیان ووشەی ڕەسەنی کوردی بووە .
* ساڵی 1979 لەگەڵ هونەرمەند سامان قادردا پێکەوە پیشانگایەکیان پێشکەش کرد .
* لە فیستڤاڵی زانکۆکاندا لە بەسرە ساڵی 1980 بەشداری کردووە .
* هەر لە هەمان ساڵدا پیشانگایەکی تایبەتی لە سلێمانی کردەوە .
* ساڵی 1982 لەگەڵ هونەرمەند نەهرۆ شەوقیدا لە هەولێر پیشانگایەکیان پێشکەش کرد .
* لەم پیشانگایەدا حەوت تابلۆی هەبوو کە ئەمانە بوون :

1 ـ لەبوونەوە تاکو مەرگ .
2 ـ مۆتەکە .
3 ـ تراژیدیای عیشقو خاك .
4 ـ وێرانە خاك .
5 ـ پەردە لەڕوو هەڵماڵین .
6 ـ شیتاڵ بوون .
7 ـ تێك شکان / خۆی لەبارەی ئەم تابلۆیەوە

دەڵێ : سوودم لە پەیکەری (داڤید)ی هونەرمەندی مەزن مایکل ئەنجیلۆ وەرگرتووە .

سەبارەت بەسوود وەرگرتنی لە هونەرمەندە ناسراوەکان دەڵێ : هەرچەندە لەم بارەیەوە زۆر ووتراوە بەڵام هێشتا بە تەواوی ڕاستی دەر نەخراوە ، من بەش بە حاڵی خۆم دەڵێم : هونەر دنیایەکی هێندە فراوانو پڕ نهێنییە کەمن هەمیشە بەسەر سوڕمانو بەو پەڕی سۆزو عەقڵەوە دەڕوانمە هەموو بەرهەمێکی هونەری بە هەموو ڕێبازو قوتابخانەکانەوە و لەهەر بەرهەمێکی هونەری زادەی گیانو هۆشی خۆمی لێ هەڵئەهێنجم ، بەڕاستی ناتوانم نکوولی لەوە بکەم کە بەرهەمێکی مایکل ئەنجیلۆ چۆن سەرسامم دەکات . هەر بەو جۆرەش هی ڤان کووخ و سلڤادۆر دالي کە هەریەکەیان لە خودی هونەرەکەوە جێی خۆی لە دەروونمدا دەکاتەوە .



سەرجەمیش بە هەموویان پێم دەسەلمێنن کە منی مرۆڤ خاوەن سەربەستیو ئیرادەی خۆمەو دەتوانم ڕوو بەڕووی هەموو ڕووخانو سەر لێ شیواویەکی ئەم سەردەمە بوەستمو زیاتر لەسەر ژیان سووربم .»

* ویستمان بزانین کاك ئازا دەیەوێ لەم حەوت تابلۆیەدا چی بڵێ ؟ . لە وەڵاما ووتی : «مرۆڤ خۆی لە خۆیدا نهێنی هەرە گەورەی ئەم گەردوونەیە لە بوونیەوە تاکو مەرگی . مرۆڤ خەوو خەیاڵە ، ڕووداوە ئەم دوو حاڵەتە دوو مەسەلەی جەدەلییەو زادەی جووڵەو مانو بەردەوامی ژیانن .

ئەم دوو مەسەلەیە هیچیان لە مرۆڤو إرادەی ژیان بەدەرنین . جا چۆن کۆیان دەکەینەوە ؟ تا ئەو کاتەی ئەو خەونو خەیاڵانەمان خۆیان لە خۆیاندا دەبنە واقیعو هیچ سەیر نابن لای ئێمەی مرۆڤ . بینەریش ئەگەر قەت هەستی بە سەربەستی نەکردبێت بەڵام کاتێ بەرامبەر تابلۆیەك دەوەستێ سەربەستییەکی گیانیو خەیاڵی دەبێت ، تابلۆ ئەو دنیایەیە کە ـ ڕاکێشەرە ـ مەبەستم لەوەیە هونەر پاڵت پێوە نانێ بەڵکو زۆر مەسەلەی مرۆڤایەتی هەن ، زۆر ئارەزووی گەورەو بەرز هەن ، زۆر نهێنی گیانی هەن لە بینەرا ، هونەر ڕایان دەکێشێتە دەرەوە ، ئەگەر لە گیانی بینەرا مردبن زیندوویان دەکاتەوە ، ئەگەر شکست بووبن دەکەونە جووڵە .

منیش لەم پێشانگایەدا زیاتر بەرەو ڕووی ـ مانو نەمان ـ و خۆشەویستیو خاكو بەر دەوامی بوومەتەوە .

بەڕاستی پێشانگاکەش وەك کارێکی هونەرىو بە ئاگاداری خۆمان لەگەڵ خەڵکەکەدا و بە جۆراو جۆری کارە هونەرییەکان لە شێوەو بیرو ڕادا : زادەیەکی چاك بوون بۆ جووڵەی هەردەم شکست نەبووی هونەری گەلەکەمان ، هیوام زیاترەو دنیاو ڕێگای هونەریش یەکجار بڵاوە چەشنی جیهانی مرۆڤ خۆی چەند زیاتر بدۆزێتەوە هەرکەمو هەر زۆرتر ماوە»

### حەمە سەعید باپیر

* لە شاری سلێمانی لەدایك بوەو تەمەنی 24 ساڵە .
* ساڵی 1977 لە پێشانگای گەرۆکی لاوانا لە سلێمانیو هەولێرو دهۆك بەشداری کردووە .
* ساڵی 1979 بەشداری پێشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلێمانی کردووە .
* ساڵی 1983 بەشداری پێشانگای پۆستەری تایبەت بە [ڕۆژی خاکی فەلەستینی] لە شاری کەرکوك کردووە .
* لەم پێشانگایەی ئەم جارەدا چوار تابلۆی هەیە

1 ـ تاڵانی ـ سەفەربەرلگ ـ
2 ـ پشتێر
3 ـ پورتریتێكو کۆپیەیەك

«لە هونەرمەندی فەرەنسایىو پێشەوای ڕۆمانتیك ئوجین دیلاکرواز یەناوی [متاریس]

* لەم هونەرمەندەمان پرسی ئاخۆ جەماوەر چۆن دەڕوانێتە هونەری تەشکیلی ؟

لە وەڵاما ووتی : ئەوەی ئاشکرایەو دەبێت بوترێ دەربارەی نەك ئێستا بەڵکو پێشتریش .

بۆ تێڕوانینی جەماوەر ئەوەیە : داوا کردنو پێ داگرتنێکی زۆر توند بۆ ناوەڕۆكو بیر وەپشت گوێ خستنی شێوەو شێواز .

دەبێ ئەوەش بزانین دوورترین و یستی ئەم تێڕوانینە دەمانگەیەنێتە ئەو بارەی کە تەنیا کاری هونەری تەشکیلی ببێتە کارێکی پۆستەرىو بانگەشەی ئاگاداری سەر دیواری تەمەن کورتو تووشکردنی هونەری تەشکیلی بە کلکایەتی لایەنەکانی ترەوەو زەوت کردنی سەربەستییە ڕەواکەی وەك هەموو کارەکتەرە زیندەگییە فەرهەنگییەکانی ژیان .

هەروەها وەلاخستنی کاری هونەری نەمر لە بەشەکانی هونەرە تەشکیلییەکە ، کە کات ناتوانێت ڕۆڵی کۆن بوو بەسەرچونی لەسەر بێنێت . هەروەها بۆ زیاتر دان پێدا نانی گرنگی شێوەو شێواز لە هونەری تەشکیلیدا نمونەی ئەدەبی لەم ڕووەوە زۆرە کە لە پێشا سەرنجیان بۆکام لایەن دەچێ .

هۆی ئەمەشی ئەوەیە سەرچاوەی ڕوناکبیری هونەریمان کەمەو هەروەها لە ڕەخنەی هونەری تەشکیلیشدا



فەریکین .

* لە پرسیارێکی ترا دەربارەی بەخۆدا چوونەوەو سوود لە تـاقیکردنـەوە وەرگرتن کـاك حـەمـە سـەعیـد ووتی .

«سەرەنجامی رای بینەران جۆرە هـەڵسەنگاندنێکـە لە ژمارەی چەندێتی بینەرانەوە چۆنێتی مـل دەنێ بەسـەر هـەڵدان و زیادبـوونەوەو ئـەمەش مـەبەستی هـونەری تەشکیلیە بەگشتی و هونەرمەندە بە تایبەتی .

هەروەها بەلایەنی خودی تایبەتی هونـەرمەنـدیش هەر هەمان پێوانەو مەبەستی دواییی کە ووترا مەودای بە خۆ داچوونەوەو هاندەر دەبێت بۆ بەرهەمەکانی ئایندەی .

**خالد رسول :**

لە شاری سلێمانی لە ساڵی 1956دا لەدایك بووە .

* ئەویش وەك هاوڕێکانی لەو پیشانگایەی لاواندا لە هەولێرو دهۆك و سلێمانی ساڵی 1977 بەشداربووە .
* یەکەم پیشانگای خۆی ساڵی 1978 کردەوە
* دوەم پیشانگای لە ساڵی 1980دا کردەوە
* لە 1978 و 1979 دا لە یەکەم پیشانگای پۆستەری شیعریدا بە چەند تابلۆیەك بەشداری کردو لە دواییشدا بـەشداری پیشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلیمانی کرد .
* لەم پیشانگە هاوبەشییەدا ئەم تابلۆیانەی هەیە .

1 - زەردە پەر
2 - پاش باران
3 - ئازار
4 - چاوەڕوانی
5 - شەو
6 - دارستانێکی نووتەك
7 - دوم و چاوێك
8 - مۆل خواردن
9 - دیوار
10 - مانگەشەو

* ئەم هونەرمەندە شتێکی نوێی لەکارە هونـەرییەکـەیدا بەکار هێناوە ئەویش ئـەوەیە مـەرەکەبی تێکـەڵ بە چـا کردوەو نەخشەی پێ کێشاوە



لەم بارەیەوە دەڵێ : ئـەمە لە داهێنـانی خۆمـەو شتێکی تازەیە لە هونەری تەشکیلیدا ماوەی هەشت ساڵە پێوەی خەریکم .

* لە بواری تاقیکردنەوەو گۆڕانکارییەکانی بـەرهەمـەکانی کاك خالد ووتی :

«هەر لە سەرەتای حەفتاکانـەوە تا ئێستـا دوورو نزیـك ئاگاداری بزوتنەوەی هونەری تەشکیلی کوردیم جا ئـەو زانیـارییـە کـەمـەی کە هـەمـە هـونـەرمـەنـدەکـان و پیشانگاکانیان و بینەرەکانیشیان دەگرێتەوە ، ئەمڕۆش کە پیشانگەی ئەم حەوت لاوە بەرەو ڕووی جەماوەر دەبێتەوە بێگومان گۆڕانکارییەك لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەویش زیاتر لە یەکگرتن و نزیك بوونەوەی ئەم حەوت هونەرمەندەدا خۆی دەبینێتەوە کە دەبێتە هاندەرێك بۆ هونەرمەندکانی تـرو لاوەکانی دوای ئێمە بۆ پێشکەش کردنی بەرهەمی زیاترو بەرەو پێش چوونی هونەرەکە .

دیسان پیشاندانی بەرهەمی جۆراو جۆر لە ڕێبازدا بینەر فێری جیاکردنەوەی ناسینەوەی قوتابخانەو ڕێبازەکان دەکات ، وە ئەوەشیان بۆ دەست نیشان دەکات کامیـان هەڵبـژێرن وە کامیان زیاتر لەگەڵ باری پێشکەوتنی ئەمڕۆی کۆمەڵدا ئەڕواو دوگونجێ و هونـەری تەشکیـلی کوردی بـەرەو ڕەسەنـایەتی دەبات

* دووبارە لە کاك خالید ڕەسولمان پرسی ئاخۆ نمونەی بەرزی هونەرمەندی هەڵکەوتوو لای ئەو کێیە ؟

- لە وەڵامدا ووتی :

«بێگومان هەر کەسێك بەکاری هونـەرییەوە خـەریك بێت مەرج نییە هونەرمەند بێت کەواتە هەندێ سیفاتی تایبەتی هەیە پێویستە لەو کـەسەدا بێ ، بـەرای من ئەوانـەش سیانن : یەکەمیان ڕەوشتی هونەرمەندەکـەیە لە ژیـانی ڕۆژانـەیدا دووەمیـان - کارامـەییی و شارەزاییی تـەواو سێیەمیان - بەرزی ئاستی ڕووناکبیری جگە لەمانـەش هونەرمەندی ڕەسەن لەخۆیدا مرۆڤێکی شۆڕشگێڕە .

پ * ئایا توانیوته لەم پیشانگەیەدا تەعبیر لە خواستی جەماوەر بکەیت ؟

و * تەعبیر کردن لە خواستو ئارەزووەکانی جەماوەری زیرەك مەرجێکی بنەرەتییە کە دەبێت لە کاری هونەریدا هەبێت ، وە لەو بەرهەمانەی کە منیش لەم پیشانگەیەدا پیشانم داون باوەر ناکەم بێ دلی جەماوەرم کردبێت چونکە من دەزانم خەڵك چەندە [مانگەشەوە تریفەدارە] کەمیان لەو گەواڵە هەورە چلکنەدا خۆش دەوێ ، یان بۆچی دیواری ماڵێکی لادێیی هەزار درزی بردووەو شەق بووە !!

**عبدالکریم رشید**

* پێش 23 ساڵ لەمەوبەر لە شاری رەمادی چاوی هەڵهێناوە .
* ساڵی 1977 لە پیشانگا گەرۆکەکەی لاوانا لە دهۆك و هەولێرو سلێمانی بەشداری کردووە .
* ساڵی 1979 لە پیشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلێمانیدا بەشداری کردووە .
* لە زوربەی پیشانگا کانی قوتابخانەکان و لاواندا بەشداری کردووە .
* لەم پیشانگەیەدا حەوت تابلۆی هەیە

یەکەم و دووەم : دایکایەتی
سێیەم و چوارەم : چاوەروانی
پێنجەم : چەند ماڵێك لە دوو رێیانێکدا
شەشەم : لەگەڵ خۆشەویستی سەر لە بەیانیانی گوندێکدا .
حەوتەم : قاتی زەحمەت کێشەکان خەرمان کۆ ئەکەنەوە .

هونەرمەند عبدالکریم رشید لە وەڵامی چەند



پرسیارێکمانا ووتی : «رێبازی ئیمپرسیانیزم کە پتر سەرنجم رادەکێشێ ، جگە لە هەندێ لە هونەرمەندەکانی سۆڤیەت ، بەلام کاری نوێ کردنەوەی بەرهەم لە سایکولوژیەت و بوونی هونەرێکی سەردەمدا راستەوخۆ لاسایی کردنەوەیەك نییە لە تەوقێکدا بەڵکو بەردەووام بوونە بە شێوەیەکی خۆیی لەگەڵ جل و بەرگ و خاك و رەوشتی نەتەوایەتیماندا هەستکردنە بە جووڵاندنەوەیەکی نوێ لەگەڵ سروشتدا بەهەموو نهێنییە جوان و ناشیرینەکانیانەوە .

وادیارە رێبازیش هەندێ کات یاساکانی سروشت وەردەگرێ ئاڵوگۆر لە کات و شوێنی بوژاندنەوەو دواکەوتنی ناوچەکانی جیهاندا ئەکات و بەم جۆرە دیاردەی هەموو رێبازێکی نوێ لە رێبازێك یا چەند رێبازێکی کۆنترەوە لەدایك دەبێت وەنەتەوەکانی جیهانی کۆن و نوێ هەمیشە لە یەکترەوە فێربوون ئەگەرچی ئاڵوگۆری مێژوو بێ سنوورە .

هونەر پێویستیەکی دەروونی ژیانی مرۆڤە جۆرە کۆمپلیکسێکی بیرو دەربرینە پێویستی بە بەهرەیەکی پارێزراوو بەپیتە .

**عمر رسول :**

* ساڵی 1957 لە سلێمانی لەدایك بووە
* ساڵی 1975 بەشداری پیشانگای 10 قوتابی کردووە
* ساڵی 1979 پیشانگای یەکەمی خۆی کردوتەوە
* ساڵی 1981 پیشانگای دووەمی خۆی کردوتەوە
* هەر لەم ساڵەدا بەشداری پیشانگای گشتی هونەرمەندانی عیراقی کردووە لە ئیتالیا .
* لەم پیشانگایەدا شەش تابلۆی هەیە : بەرگری ، پاش بەرگری ، نەمر ، ژیانەوە ، زیندانییەك ، مەرگو خۆشەویستیەکی بێدەنگ .
* لە وەڵامی چەند پرسیارێکدا سەبارەت بە هونەرو رێبازی هونەرمەند کاك عمر ووتی :

«هونەر وەك شێوەیەك لە شێوەکانی هۆشمەندی کۆمەڵایەتی : کار دانەوەی بارو دۆخی واقیعە لە شێوازێکی تایبەتیدا ... ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بڵێین کە سیماو ناوەرۆکی قۆناغێکی مێژوویی لە ژیانی کۆمەڵێکدا دەبێ

رەنگدانەوەی خۆی هەبێ لە هونەردا .
هەر لەم بوارەشەوە دەتوانین بڵێین کە هونەری ڕاستەقینە نوێنەری ڕاستی ئازارەکانی مرۆڤەو پەیامی مرۆڤایەتی هەڵگرتووە .
مەسەلەی (هونەر بۆ هونەر) وەك ڕێبازێك بریتی بوو لە دابڕین لە واقیعی ژیانی مرۆڤ و لە خزمەتی دەستەو تاقمێکی بەرژەوەند تەسکدایەو دوورە لە ئازارو ئاواتی گەل

**نەهرۆ شەوقی :**

- سالّی 1959 لە سلێمانی لەدایك بووە
- سالّی 1977 بەشداری پیشانگای گەرۆکی لاوانی کردووە
- سالّی 1978 لە فیستڤالّی زانکۆکاندا لە موسل بەشدار بدوە
- سالّی 1979 لە پیشانگای پێنجەمی هونەرمەندان لە سلێمانی بەشدار بووە .
- سالّی 1980 بەشداری فیستڤالّی سێیەمی زانکۆکانی کردووە لە بەسرە .
- سالّی 1982 پیشانگای هاوبەشی لەگەلّ ئازا حەسیبدا کردووەتەوە
- لەم پیشانگەیەدا حەوت تابلۆی هەیە کە بەگشتی ڕێبازی تەعبیرییان پێوە دیارە سەبارەت بە ناوەکانیان کاك نەهرۆ دەڵێ : هەندێکیانم ناو ناون وەك 1 ـ گۆرهەلّکەن 2 ـ ژان 3 ـ کۆچەرەکان 4 ـ قزلەر . هەندێکی تریان ناوم لێ نەناون ئەویش بە مەبەستی دانەنانی سنوور بۆ بیر کردنەوەی بینەرو بەستنەوەی بە تەنیا ناوێکەوە .

هەروەها «نەهرۆ» ووتی : ئاشکرایە هەموو بەرهەمێکی هونەری بریتیە لە فۆرم و ناوەرۆك ، فۆرمیش پێکهاتوویەکی خەت و ڕەنگ و کۆمەڵێك رووبەر لەگەلّ هەستدا .

- ڤان کۆخ نموونەی بەرزی هونەرمەندە لەلام
- هونەری تەعبیری ... تەعبیرێکی ڕاستگۆیانەیە لە جیهانی ناوەوەی هونەرمەند لەکاتی مامەلّەکردنی لەگەلّ جیهانی واقعی دەرەوەیدا .
- بەرای من هونەرمەند لە هەلّبژاردنی ڕێبازی هونەریدا ئازادە بەمەرجێك پارێزگاری (قیمی فنی) بکات و مامەلّەیەکی ڕاستگۆیان لەگەلّدا بکات .
- گرنگ ئەوەیە هونەر لە خزمەتی مەسەلەی مرۆڤایەتیدا بێ

(مندالّە بچکۆلەکەو گەشتی چارەنووسی)

لە ئامادەکردنی قاسم محمدو گۆڕینی [محمود زامدار]ە تیپی نواندی سلێمانی ئەم شانۆ نامەیە بۆ منالّان پێشکەش دەکات لەبەر ئەوەی ئەم جارە ماوەمان نەما لە ژمارەی داهاتودا زیاتر لەسەری دەنووسین ، ئەم بەرهەمە هونەرمەند رزگار کریم دەرهێنەریەتی .

●

# لە دهۆك

● ل ئامادەکرنا مەتین ●

**«ناف و ناس ناف دکوردی دا»**

ل رۆژا ئێك شەمبێ 1983/7/17 ، سەیدایێ هێژا «محمود زامدا»ی لکۆرانگەهەکا ناڤخویی ، ژبزاڤێت ئێکەتیا نفیسەڤان و تورەڤانێت عیراقێ ـ نفیسەڤانێت کورد تایێ دهوکێ .. بابەتەك پێش کێش کر ، لژێر ناڤێ «ناڤ و ناس ناڤ ، دکوردی دا» . هژمارەك نفیسەڤان و ئەدەب دوستا ، لڤێ کۆرنگەهێ ئامادەبون . لپێشەکیێ بگشتی سەیدا لسەر ناڤا ئاخفت د مێژوویێدا . ئەگەرێت بوینە هویێ بەلاڤبونا ناڤا دناڤ خەلکیدا دیارکرن . پاشی بتایبەتی لسەر ناڤا ئاخفت . بەحسێ هەر جورەکێ وان کرو چەند نمونەك بسەر ئینان . ژوان رەنگێت ناڤا ، ناڤێت ئایینی ومێژووی وناڤێت پێغەمبەرا . وە ناڤێت ژئیرانی و تورکی و تورکێت ئوسمالی هاتینە وەرگرتن .

پشتی هینگی بگشتی لسەر ناڤا ئاخفت ، (30) خال پێش چاڤی کرن . چەند ناڤێت کوردا هەنە بێت نێرینە و مێینە ژ



ڤان خالا دەرناکەڤن . ژ ڤان خالا ، ناڤیت عەرەبی‌و عیبری‌و فارسی‌و ئەرمەنی ، ناڤێت حەیواناوگولاو جهـو وارا دکفشن . هەروەسا باسێ ناڤێت ئەوروپی‌و مەعنەوی‌و ناڤێت روناکی‌و ستێرا ڤان خالا کریە . ژلایەکێ دیڤە لسەر ناس‌ناڤ‌و بچویک‌کرنا ناڤا ئاخفت‌و نمونە بسەر ئینان .

سەیدای دیارکر لڤیرێ کو ناڤێت کوردی بێت پەتی تێنە بچویک‌کرن دیسا بێت بیانی‌و خوجهی ژی . نێزیکی (16) ناس‌ناڤا کاک «محمود»ی هژمارتن بنمونەڤە .

پشتی بابەت کوتابوی گێنگەشەکا گەرم‌و بەرفرەهـ چێبو . چەند بیرو رایەکێت باش خو لپاناڤا گێنگەشێ چکلاندن بابەت چەندێ ب مفاو بها بو ، هێژ چەورتر و دەولەمەندتر لێ‌هات . کاک ئەنوەری دەرگەهێ گێنگەشێ ڤەکرو لسەر بابەتی گۆت : براستی بەحسەکێ هێژاو بێ بنەرخ‌بو . لێ هەر چەندە پێدڤی بو سەیدایێ مە ، ناڤ دابەش‌کربان ، لسەر قوناغا وە بتایبەتی قوناغێت رامیاری چونکی پشتی هەر قوناغەکێ هندەک ناڤێت نوی دەرکەڤتینە بو نمونە قوناغا پشتی بەیان‌ناما یازدەی ئاداری . پاشی دیارکر رەنگەکێ ناڤا کا دەیبابا ژبەر چ ددانانە سەر بچویکێت خو ، گوت : هندەکا هـزردکر ، هـەکە نـاڤێت ب‌ترس‌و سەهم داننە سەر بچویکێت خو ، کەس چاڤـا لێ نادەت . هەر وەسا کومرەشییێ پێ نابەت وەکی ناڤێ کورگو - هرچو .

ددویڤرا کاک عبدالرحمن مزوری تـرارێ خو د کـانیێ هلاند باسێ هندەک نێدیەمێت بیانی کربێت د سەرەتایی یا کوتارا سەیدای‌دا هاتین . پاشی دیارکر کو یا فەربو سەیدایی ناڤێت گولاو تەیرو تەوالاو حەیوانـاو فێقی ، ژهەق بـاشقە بـاشقە کربان . «وەصفی ردێنی» ژی چەند رایەکێت جوانێ دیارکرن گۆت . لتم پشتی جەنگا هندە ناڤێت بیهنا شەرو جەنگا ژێ دفریت بسەر دکەڤن مینا حەربی/ حربیا . هەر وەسا عەیانکر کو باهرا پتر ژبابێت خودان هزرو بیرێت رامیاری . لدویڤ هزرو بیریت خو زارووییت خو ناڤ‌دکرن .

کاک «قاسم»ی لسەر ناڤا دیارکر کو بچویکی لگەلەک گاڤا دو ناڤ هەنە ئێکێ براستاو ئێک نەء . ئاشکراکر ژی کو ناڤێت مروڤێت بکێرهاتی‌و چەلەنگ ، ناڤێت پالەوانو پالەوانی‌یا هندەک ددانە سەر زارووییت خو .

سەیدایێ «صدیق شرو»ی‌پشتی رێزلکاک «محمود»ی‌و بابەتێ وی گرتی بکورتی خو بناڤ قوناخێت پێشکەڤتن‌و وەرارا مێژوویی‌دا بەرداو گۆت : هەر قوناخەکێ ناڤێت خو‌ییت تایبەتی بومە بەلاڤ کرینە . پاشی باسێ بچویک کرنێ دشێـوێت زمانێ کـوردی‌دا کرو تـایەکی دی لبـابەتی زێـدەکر ئـەوژی ناڤێت نەمرییێنە . سەیدا «محمد أمـین صالح» ی دەربـاری ناڤێت ئێـزدیا گـۆت : کو نـاڤێت وان دتایبـەتینـە بـوانڤـە ژکـەسێ نەوەرگرتینە ، چەند نمونەك لسەر ئانین مینا : پیرگرو شەمو/ قطو ..هتد . کاک «حجي جعفري» ی بەحسێ ئەڤێت بێ زاروکر گۆت : هندەکێت بێ زارو ئەڤێت دابین (قناعة) بشیخ‌و مریدا هەین دچنە با وان ژ خوەرا داخاز دکەن . هەکە هات‌و خودێ کەرەم کر . لڤر ناڤکرنا زاروی دبیتە خەما شێخی . وە دیارکر کە ئەڤێت پاش باب دبن گەلە جارا ناڤێ بابێ خو راکریەو بێ ناڤکریە . کاک جلال ونجیب وشڤان چەند نـاڤەکێت ژێ‌هـاتی خرکرنە سەر ناڤێت د بابەتی‌دا هاتین بێت تایبەتی لدەڤەرێ . کاک «نذیر» ی چەند تێبینیەکێت چاك رون‌کرن ئێك ژوان کوردا ناڤێت هوزانڤانێت خو راکرینە . لجهەکێ دی گۆت : مال هەنە ناڤێ مێهڤانا رادکەن ئەوژی دبیت روژا خودێ زارو دایە ژنکێ مێڤانەك لمێهڤان داری‌یا وابو ژلەوما ئەڤ ناڤـە راکر . لسـەر ناڤکرنا ناڤێ یارێ ، هەنە حەژێك کرینەو نەگەهشتینە ئێك ، دێ بینین پشتی کچکێ شوی‌کری‌و زاروەك بوی نـاڤێ یارێ خـو دانایە سەر کورێ خو . کاک «احمد عبدالله» لسەر بچویك کرنا ناڤا ئاخفت‌و ، بکورتی لسەر بچویکرنا ژبو خوشتڤیـاتی‌یێ ئو عەیانکر کو لدەڤەرا بادینا «ك» یا بچیك کرنێ ناهێت مینا دەڤەرا سوران ئەو دکارن بێژن «محوك» ل‌با مە وە نابێژن . سەیدایێ «رشید فندي» بنیاتێ هندە ناڤێت دگوتاری‌دا هاتین روَن کرن . پاشی بەحسێ دەورێ ژنکێ کـر د شارستـانەتێیـداو گۆت : د هەمی قوناخادا ژنك ژێر دەستا زەلامی بو . ئەڤ چەندە ژی ئاینیا زل کریەپاش بەحسێ رەنگەکێ ناڤا کر . ناڤێت راگرتنێ‌و ناڤێت کەڤتنێ وهەست بشکەستنێ . برادەرەکێ دی گۆت :

